# رووپێوێکی جیۆپۆلیتیکی

## دەربارەی میرنشینانی گردی بناری و زاگرۆس


**یسپەر ئایدم و یۆرگین لاسو**

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

**ئاسۆس محەمەد مەلا قادر**



**کوردستان – هەولێر**

**٢٠٠٥**



**ناوی کتێب:**

**رووپێوێکی جیۆپۆلیتیکی دەربارەی میرنشینانی گردی بناری و زاگرۆس**

- نووسینی: یسپەر ئایدم و یۆرگین لاسو
- وەرگێڕانی: ئاسۆس محەمەد مەلا قادر
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: (٣٢٩)
- چاپی یەکەم
- نرخ: ١٠٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب – ٣٠ – (١٣٣)

**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com

ژمارەی تەلەفۆن: 2260311

www.mukiryani.com

## ناوەڕۆك

## ١- دەروازەیەك

ئەرشیفەكانی شمشارە بە سێ ئاسۆی جیۆپۆلۆتێكی جوداوە بەندیوارن : هەرێمی ناوچەیی دەوروبەری خودی شوێنەكە بە مات ئوتێم ناسراوە، ولاٚتی دەرگەوان،[1] هەروەها ئەوشارۆچكە و لادێیانەی لە نێویان لە نزیكی ئەم ولاٚتەن، دەولەتە شارەكانی میسۆپۆتامی بەلاٚی ڕۆژئاوا دا، دواجاریش ئاسۆی ڕۆژهەلاٚتی زاگرۆس. ئەو نامانەی لێرەدا بلاٚوكراونەتەوە سەرەڕای ئەوانەی پێشتر لە Sha2 (بەتایبەتی بڕوانە ل ٥٤-٥٦، هەروەها ٤٠-٤٢) پێشكەش و تاوتۆیكراون، زانیارییەكی كەم سەبارەت بە هەرێمی ناوچەییدەخەنە بەردەست.

لەلایەكی دیكەوە دەبێت هەردوو ئاسۆ نێو دەوڵەتییەكە لێرەدا تاقیبكرێنەوە بۆ ئەوەی ڕووداوە سیاسیەكانی پەیامنێری (كواری) ڕوونببنەوە.

بەشێوەیەكی گشتی كۆسپی ڕوون و بەرچاو و ئەستەمی بنیادنانەوەی مێژووی جوگرافیای ڕۆژهەلاٚتی میسۆپۆتامیاو بەتایبەتیش سەبارەت بە زاگرۆس هەن.

---

(1) بڕوانە لاسو ١٩٦٨. تەواو پێدەچێ ئەم نێوە وشەیەكی بە ئەسڵ ئەكەدی باو بوو بێت بۆ ناوچەیەكی جوگرافیایی نائەكەدی. تومی چەرخی ئاشووری نوێ بەگوێرەی لیڤێرانی(١٩، ١٩٩٢ف) كەوتۆتە هەمان ناوچەوە، پێدەچێ دەنگدانەوەیەكی ئوتوم بێت. كەمێك دواتر ئوتوم- ی دەدۆزینەوە، كەوتۆتەوە لای ڕۆژئاوای كەناری دیجلە لە دەقێكدا ژوانێ بلاٚویكردۆتەوە(١٩٩٢، ناتوانم بە پێشنیاری ئەوێ قایلببم،١٩٣ن.١٨، كە لە ARMI,5-دا باسكراوە، لەوانەیە یەكێك بێت لەوانەی ڕۆژئاوا).
ڕوونكردنەوەی ئەمەش بەدڵنیاییەوە دەرچوونە ڕۆژهەلاٚتی دۆكومێنتكراو لە شمشارە و ماری- دا، لە پێناو ئەو مەڵبەندەی دیجلە، كە دەربەدەرەكانی زاگرۆس دایانمەزراندوە(یان نێویان هێناوە تەوە).



هێژ ئەم ناوچانە بە شێوەیەكی هەژارانە لە سەرچاوە بابلییەكاندا دۆكومێنتكراون و ڕەنگە هەروا بمێننەوە تا وەكو ئەرشیفی زیاتر لە ناوچەكانی نێو ئەم هەرێمەدا دەدۆزرێنەوە. ئەرشیفەكانی ماری زۆر زانیاری گشتی لە نێو خۆ دەگرن، وەلێ تیشكی سەرەكیان ناخەنە سەر دەوروبەری (periphery) ڕۆژهەلاٚت و تەنانەت كاتێك لە سەردەمێكی داهاتودا بە تەواویش بلاٚوبكرێنەوە، بەزەحمەت دۆكومێنتكردنی چڕو وردو دروست دەخەنە بەردەست.

پرسێكی دیكە كە پێڕۆی بەراوردكاری و رووپێوە شوێنەواریە باش بلاٚوكراوەكانە لەم هەرێمەدا، مەزندەكردنی جۆری نشینگەكانی زەحمەتدەكات، هەروەها بە شێوەیەكی كردەیی هەوڵی دیاریكردنی شوێنی ڕاست و دروستی شوێنە جوگرافییەكان (Toponyms) موستەحیلە.

لەبەرئەوە، هەموو ئەوەی لەم قۆناغەی توێژینەوەكەدا دەتوانرێ هەوڵی بۆ بدرێ ڕەنگرێژییەكی نزیكەیی دیمەنی سروشتی جیۆپۆلۆتیكییە، كە تێگەیشتنێكی جۆری شوێنە بەندیوارەكان سەبارەت بە دەولەتە سەرەكییەكانی سەردەمەكە دەخاتە بەردەست.

وەك خاڵێكی لێكجیاكردنەوە سەبارەت بە ڕەنگرێژییەكی لەم چەشنە یەكەم جار وا گونجاو دەردەكەوێت، كە بە بایەخپێدانەوە هەرێمە كە بۆ زنجیرەیەك ناوچە دابەشبكرێت ((كەوان)) هەروەك لە كەنارەكانی دیجلە بەرەو ڕۆژهەلاٚت بەرەو شاخەكانی ئازەربایجان و كوردستان و لورستان ماوەیەك دەكێشن.

دواتر وەك بنەمایەکی ڕێبەری بۆ گریمانکردنی ئەوەی، کە ماوە و ڕادەی ورد و دروستی ئاماژە پێدانەکانی لە ولاَتی نزمدا هەن سەبارەت بە هەر دەوڵەتێك، کە کرۆکێکی هەبێت ئاماژە بەوەش دەدات بۆ کام ،، کەوان،، دەگەڕێتەوە.

ئەمەش بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا بنەمایەکی مەترسیدارە (گرنگە)، وەلێ وا دیارە بە وریابوونێکی تایبەتی بەکاربهێنرێ دەرئەنجامی ماقوڵ دەخاتە بەردەست.

چوار ناوچەی خودان دەوڵەتی گرنگ بە شێوەیەکی رێك و پێك لە باکووری رۆژئاواوە و بەرەو باشووری رۆژهەلاَت لیستکراون، کە ڕەنگە بەم شێوەیە دابندرێن :

١- لەسەر رووباری **دیجلە**

نورگوم — ئیکالاتوم -ئاشوور-ئیشنونا

٢- لە رۆژهەلاَتی دەشتی **دیجلە**

ئوربیل /قەبرا- ئەرانجا -ئیشنونا

٣- لە گردە بنارییەکانی زاگرۆس

کومی-یاعیلانوم — ئەخازوم — کاکموم — شیموروم، نامەر، نیکوم

٤- لە نێوەوەی زاگرۆس

توروکوم /لولوبوم — گوتیوم — عیلام



ناوچەی یەکەم پرسێکی راستەوخۆ ناخاتەوە[2] .

نورگوم هەرێمیك بووە لە دەوروبەری نەینەوا (**نینێت**) —دا، پێدەچێ ئەم شارە پایتەختی بووبێت، و پێدەچێ پادشایەکیشی هەبووبێت نێوی کیپڕام بووبێت[3] .

ئیکەلاتوم پێدەچێ بکەوێتە سەر **دیجلە** و زۆریش لە باکووری ئاشوور دوور نە بێت[4] ، ئەشنونا-ش وا پێدەچێ حەوزی دیالەی بەرەو سەر —

---

[2] بۆ رووپێوی(overview) نوێی جوگرافیای مێژوویی سووریا و میسۆپۆتامیا لەم سەردەمەدا بڕوانە ژۆنێ (Jones) ١٩٩٦.

[3] .Cf. yohong 1994a. نورگوم تەنها لەم سەردەمەدا بەدەستهێنراوە و ناوەکەش تا ڕادەیەك دوای داگیرکردنی شەمشی-ئەدەد وندەبێت.
بەتایبەتیش ئەگەر هاوڕێککردنی نەینەوا= نینێت راستبێت، ئەوا نێوی سێهەم گوماناوی دەردەکەوێت، نوروگوم دەبێت ئاماژە بە هەمان شوێن بدات، هەروا پێدەچێ نوورگوم تەمەن کورتبوبێت و لە هەرێمی نەینەوادا شوێنێکی باش قایمکراو بووبێت، کە ئێستاکە زەحمەتبێت لەسەر زەوی دیارییبکرێت.
کیپڕامی دیاریکراویش یەکەمەو، پێدەچێ یەکێك بێ لەو نۆ پادشا هەرە گرنگەی لە MEC -دا لیستکراون، کە لەلایەن شەمشی-ئەدەد یاخود کوڕەکانییەوە لە ماوەی ساڵی لیمو (lĬmu)ئاشوور مەلیك-دا تێکشکێندراون، کاتێك نوروگوم داگیرکرا.
نێوی کیپڕام لە پێش نێوی یاشوب- ئادو(-ی ئەخازوم) هاتووە. کە وابوو تەواو پێدەچێ پادشای نوروگوم بوبێت.

[4] بە شێوەیەکی تەقلیدی بە(التلول الهیکل)-ی سەر کەناری رۆژهەلاَتی **دیجلە** هاوڕێککراوە، کە بە بیست کیلۆمەترێك دەکەوێتە باکووری ئاشوور.
هەرچۆنێك بێت، بەم دواییانە دیتمان(Ditmann) ( 1995,101,cf.also LaessØe apud Eidem and HØjlund 1997,30f) چەند زانیارییەکی دەربارەی هەیکەل خستە بەردەست، کە هاوڕێککردنەکە دەخاتە گومانەوەو لە جیاتی هەیکەل تەل عەقرە

هەروەها دۆلی حەمرینیشی گرتبێتەوە، کە تێیدا چەند شوێنیك خشتەکانی سەردەمی بابلی کۆنیان خستە بەردەست بە مێژووی ساڵەکی ئەشنونا (ئێشنونا) مێژووێندراون.

ناوچەی دووەم لە چاودا بێ کێشەیە.

وادیارە هەر یەك لە ئوربیل (ئەربیل) و ئەراپخا (کەرکووك) دوو دەولەتە شاری سەربەخۆ بووبن کاتێك لە لایەن شەمشی —ئەدەد و دادوشەوە داگیرکراون.

سەبارەت بە ئوربیل لە راستیدا تەنها نووسینە رەسمییەکانی وەك کیلە نووسی (Stele) قەبرا و دادوشە ئەم نێوە بە کاردەهێنن، لە کاتێکدا سەرچاوەکانی دیکە بە شێوەیەکی تۆکمە ئاماژە بە شارۆچکەیەك وولاتێك دەدەن پێی گوتراوە قەبرا.

بەم دواییانە پێشنیار کراوە، کە پێدەچێ قەبرا لەگەل قەلای باقەرەی ئاشووری نوێ- دا هاورێك بێت ، کە دەکرێ بە تەواوی و شێوەیەکی

---

پێشنیار دەکات، کە بە بیست کیلۆمەترێك دەکەوێتە رۆژهەلاتی ئاشوور، هەروەها لەسەر کەناری رۆژهەلات، وەك بەربژاردەیەکی جێی ئەگەر.
بە دلنیاییەوە وا دیارە عەقرە لەم سەردەمەدا شوێنێکی گرنگ بووبێت، وەلێ پێشنیاری دیتمان(Ditman) بە پێچەوانەی توێژینەوە نوێکانە، کە ئەوە دەخەنە ئەنجام لە بەرەکەی دیکە، کەناری رۆژئاوای دیجلە، دەبێت بەدوای ئیکەلاتوم — دا بگەرێین ( Heimpel 1996,charpin and Durand 1997, 3,8ff)، لەگەل ئەوەشدا هیچ شوێنێکی کۆن پێشنیارنە کراوە.



ورد و دروست بکەوێتە نزیکەی ١٥-٢٠ کم لە باکووری رۆژئاوای ئالتون کوپری (Deller 1990b).

جێی سەرنجە تێبینی بکرێت، کە پێدەچێ سێ دەولەتەشارە کۆنەکە لەم هەرێمەدا واتە ئاشوور نەینەوا و ئوربیل، لە رووی سیاسییەوە لە ماوەی سەرەتای هەزارەی دووەمی بەر لە زایندا بە هۆی پایتەختی سەربازی تازە دامەزراوی وەك ئیکەلاتوم و نورگوم و قەبرا- ەوە کەوتبنە دواتر.

بێگومان ,,تەقلید ،،-ی دامەزراندنی پایتەختی نوێ لەلایەن پادشا ئاشوورییەکانی دواتریشەوە ئەنجامدراوە، گریمانی زۆر پێچوو ئەوەیە، کە پیاوە ئامووورییە نێودارەکانی لە سەرەتای هەزارەی دووەمی بەرلەزایندا لەم هەرێمەدا دەستەلاتیان پچکرِی (usurped) ، بە هەمان پالنەر گەلێکەوە لاچووبن.

ئەوان پێیان باشتر بووە لە پایتەختە قایمکراوەکانی خۆیاندا نیشتەجێبن، کە ماوەیەك لە شارە گرنگە کۆنەکانی وەك ئاشوورو ئوربیل دوورن، کە پێدەچێ بنکەی دەستە بژێرە شارستانییەکان بە نهێنی کردبنیانە مەلبەندی مەترسیداری بەرگری و هەلگەرانەوە.

**٢- پادشا نشینانی گردی بناری خابوراتوم و کومی**

پرسی راستەقینە لە ناوچەی سێیەمدا دەستپێدەکات، کە تێیدا دەولەتی جیاواز بەشێوەیەکی نەدارانە دەردەکەون، وەلێ لە سەرچاوەکانی ولاتی خوارووادا بە تەواوی دیار نییە.

تەواوی ئەمانەش دەبێت بکەونە لێواری تەواوی شانۆی میسۆپۆتامیا، لە گردی بناری و زنجیرەکانی ئەوپەڕی رۆژئاوای زاگرۆس.

سوچی دووری باکووری رۆژهەڵاتی عێراقی نوێ و ناوچەکانی دەوروبەری، کە چەند دەوڵەتە-شارێکی گرنگی تێدا هەڵدەکەون، لە دەقەکاندا بەحەستەم (barely) بەڵگەدارە. لە(1 and 2) — دا شەمشی — ئەدەد چەند رێگەیەك بۆ نێردراو کوشیا پێشنیار دەکات، بە رێگەی وڵاتی خابوراتوم و کومی بە دوای یەکدا، رێگەکانی لە باکووری رۆژئاوای شمشارەوە بە درێژای گردە بنارییەکان بەرەو حەوزی خابوور دەچن، وەسف دەکات، وەلێ زۆر پێدەچێ لە هەرێمی (نورگومی) دوژمن دوریبخاتەوە لە دەوروبەری (موسڵ)ی ئێستادا.

## ئەخازوم

وڵاتی ئەخازوم بە شێوەیەکی تایبەتی لە دەقەکانی شمشارە و ماریدا دەرکەوت، وەڵێ دەتوانرێ شوێنەکەی بە تەواوی و بە وردی لە سەرچاوە فەراهەمەکاندا وێنە بکرێت.

دەبێت ئەخازوم ناوچەی نێوان دەشتی رانیە و هەولێری سنووردا بێت لە دەوروبەری شارۆچکەی کۆیی سنجاقی ئێستا دا.

(یاشوب —ئادو)ی پادشای ئەخازوم کۆمەڵە هاوپەیمانیەتێکی بەرەو (باکوور)-ی رۆژهەڵات لەگەڵ توروکییەکاندا و بەرەو باشوور(-ی



رۆژهەڵات) لەگەڵ شیمورم —دا و بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ شەمشی ئەدەد و بەرەو باشوور(ی رۆژهەڵات) لەگەڵ کاکموم —دا، دروستکرد.

سنووری رۆژئاوا زیاتر لە لایەن ئەو راستییەوە تیل نیشاندەکرێت، کە یاشوب —ئادوو کۆمەڵێك کۆبوونەوەی لە ئەرانچاو یائینوم —دا(قەبرا) لەسەر لێواری زێی بچووکدا لەگەڵ شەمشی —ئەدەد-دا هەبووە .پایتەختی ئەخازوم شیکشابووم —بووە، کە لە دەقەکانماندا زۆر ئاماژەی پێدراوە، هەروەها لە سەرچاوەکانی بنەماڵەی ئوری سێیەمیشدا ناسراوە بڕوانە: (Astour 1987,34f).

دەبێت بکەوێتە ڕێڕەوی زێی بچووك بەرەو خوار لە شمشارەوە، پێدەچێ لە نزیك شارۆچکەی تەقتەقی ئێستادا بوبێ.

(ئیکلاتوم و تارۆم)—یش دوو شارۆچکەی دیکەن لە ئەخازوم —دا کە لە دەقەکاندا باسیانکراوە (cf. index,s.n.).

## یائیلانوم

ئەو دەوڵەتەی بە یائیلانوم ناسراوە بە زۆری بە نیشانەی بەڵگەدەر (determinative).-ی نێوی کەسی نوسراوە، پێدەچێ نێوەکەی لە فەرمانڕەوایەکی دامەزرێنەری بە رەچەڵەك ئاموری — ناو لێنەر(eponymous)داتاشرابێت (cf.Eidem 1985,85 n. 11).

ئەو شوێنانەی بە هەرێمەکەیەوە پێوەندبوون شارۆچکەکانی خیمارە و توتارۆم (توتەڕوی )، و چەند شوێنێکی دیکەن بە (دور یائیلانیم) نێوبراون.

بەگوێرەی کێلە نووسی دادوشە وARM 1131، توتاڕو شارۆچکەیەك بووە لە ماوەی هەڵمەتێك لە قەبرادا  داگیرکراوە، ئەو ئینتیباعە گشتییە بەهێز دەکات، کە هەرێمی یائیلانوم زۆر نزیك بووە لە دەوروبەری قەبرا —و پێش دەچێ لە گەڵیدا تێکەڵبوو‌بێت. فەرمانڕەوای یائیلانوم بینا (یان-ماڕ)-ئادو-یەکی ناسراو بووە، کە لە جەنگێکدا لەتوتاروم لە لایەن ئیشمی — دەگەن تێکشکێندراوکوژرا و سەری بڕرا( Charpin 1994)، (ARM IV33)،  یەکێك لە خوشکەکانیشی یەکەم جار لە هەرێمی ئیشمی — دەگەن ژیانی بە سەربرد، دواتریش لە هەرێمی ئادەل —شینی بوروندومی — دا .(m.8161, see merello 1997).

## کاکموم

نامەکانی شمشارە و سەرچاوەکانی  لە تەل  لەیلان  و ماری — دا دۆزرانەوە بە شێوەیەکی زۆر زانیاری دەخەنە سەر زانیارییەکانی پێشوو، لاوازترین بەڵگەش سەبارەت بەکاکموم، بەم دواییانە لە لایەن ئاستورەوە (1987,8-1) پوختەکراوە، کە بە شێوەیەکی ئەزموونی کاکموم — ی لە هەرێمی نێوان ئیکەلاتوم و هەولێر — داناوە.

هەر چۆنێك بێت، ئەم شوێنە بە شێوەیەکی راستەوخۆ بەڵگەکانی لە شمشارە دۆزراونەتەوە تایبەتی دەکەن، چونکە لێرەدا کاکموم وەك دوژمنێکی شەمشی- ئەدەد دادەنێن، لەکاتێکدادوای ئەوەی هەولێر لەگەڵ ئیمپراتۆریەتدا یەکیگرت، جا لەبەر ئەوە پێویستە لە شوێنی دیکەدا بۆی بگەرێین.

ڕەنگە سەرچاوە فەراهەمەکان بەم شێیوەیە بەکورتی دەریبخەن :



## هەزارەی سێهەم

- یەکەم جار دەبێت ئەوە تێبینی بکرێت، کە GN Kakmum بە زۆری لە دەقەکانی ئیبیلا-دا ئاماژەی پێدراوە، بەندیواری دەکا بە شارێکی هەمان کرك و هەمان نووسین (homonymous) لە رۆژئاوای سووریادا (بڕوانە,Archi 1993,32 ).

- دەقێکی بنەماڵەی ئوری سێیەم بەیەکەوە کاکموم لەگەڵ گومارشی و شێرشی و شێشابی —دا باسدەکات، بە شێوەیەکی تەواو نەدارانە ئەو هەرێمانە دەردەکەون، کە بەگشتی بۆ باکووری رۆژهەڵاتی میسوپۆتامیا دەگەڕێنەوە بڕوانە: (Astour 1987,10,)، هەروەها بۆ تاوتوێی ئەم شوێنە جوگرافیانە بڕوانە Passim).

## هەزارەی دووەم

### أ- سەردەمی شەمشی — ئەدەد

- لە نامەی (٦٩)دا یەکێك داوا دەکات (لاڤەدەکات) پادشاکانی عیلام و نامری و نیکوم قایلیکات بۆ هێرشبردنە سەرکاکموم.

-هەروەك لە(1 and 2)-دا پێشاندراوە یاشوب — ئادوی ئەخازوم — ی، ئەو ولاّتەی شوێنەکەی لەکەناری باکووری زێی بچووك لە خوار دوکان (ناوچەی دەروبەری کۆیی سنجاقی ئێستا)دادەنێین ، لە هاوپەیمانییەتی شەمشی- ئەدەد جیادەبێتەوەو دەبێتە هاوپەیمان لەگەڵ کاکموم —دا.

-له(٤٤) – دا موشكاوى فەرمانڕەواى كاكموم لە لايەكى ديكەوە هێرش دەكاتە سەر شارۆچكەيەكى ناديار بەكيگيبشى نێوبراوە، كوارى-ش داواى خەڵك دەكات بۆ دژە هێرشێك.

**ب- سەردەمى زمرى – ليم**

-ARM VL79 باسى نێردراوێك دەكات لە كاكموم – ەوە بە ڕێگەى مارى –دا(en route tomari )

-489 ARMT xxvl 12 (Guoted below ch.7) : بوقاقوم لە ئيكەلاتوم –ەوە ڕادەگەيەنێ كە گوڕگوڕوم –ى كاكموم –ى بە ٥٠٠ كەسەوە هێرشى كردۆتە سەرقەبرا و هێزێكى ٢٠٠٠ هەزاركەسى تێكشكاندووە، كە ئەرديگەندى قەبرا-يى لە دژى ئەو ناردوويەتى .

-ARMT XXV I/ 2 512: ئيدياتوم (لە كەرەنا) ڕادەگەيەنێت، كە نێردراوێكى زيمرى ليم لە قەبراوە گەيشت، پێوەنديكردووە، كە يادوڕانوم –ێكى ناسراو و پياوەكانى هێرشيان كردۆتە نێوان ئەراپخا وكاكموم.

**ت – سەردەمى دواى تالآنكردنى مارى**

حامورابى (خاموراپى ) نێوى ساڵى **٣٧** تێكشكانى گوتيوم و كاكموم و سوبارتو دەژمێرێت.

- دوو دەق،(OBTR 255 and 261) لە ريماح دۆزراونەتەوە باس لە ئەگەرى بەشداريكردنێكى بەرچاوى (كاكمييەكان) دەكەن لە گەشتێك



ياخود لە شالآوێكدا و لە شارۆچكەكانى هەرێمى نێوان سنجار (ژەنگار) و نەينەوادا مانەوە .

-دەقێكى كارگێڕى، كە لە تەل لەيلان- دا دۆزراوەتەوە ( vincente 1991, no.83) كێشەى جل و بەرگێك بۆ نێردەيەك لە كاكمييەكانەوە تۆمار دەكات.

- ئايدم ( also from leilēn, quoted in Eidem 1991b,120 (w.n.14 n.d, no.8

ئاماژە بەسەربازەكان لە كاكموم –ەوە دەدات، كە لە لايەن پادشاكانى لەيلان وكوردا وكەرەنا(؟)-وە – بەكرێگيراون (؟)-Ab B 2.A6: نامەيەكە لە لايەن دووكەسەوە نێردراوە، كە دوژمن گرتونى (nakrum) لە سەرووى (elēnum) ئيكەلاتوم، هەروەها ئەوان لە كۆشكى كاكموم –دا بەند دەكرێن[5].

- ئونگاند،Abph 134: باس لە خەڵكێك دەكات لە ئەراپخا و كاكموم –ەوە لە ولآتى بابل –دا گوێزراونەتەوە(سەردەمى سەمسو – ئيلونا)، ئاماژەدانەكانيش بە كاكمييەكان لە دەقەكانى لەيلان و ريماح –دا پێدەچێ پێوەندبن بە جاشەكان (بەكرێگيراوەكان)-ەوە ، نەك بەتايبەتى

[5] cf. بۆ ئەم دەقە: char pin and Durand 1997,36,n.15 (تێبينى دەكرێ، كە خوێندنەوەى GN بە كاكموم گومانى تێدانەبێت چونكە Til- Agmim بە شێوەيەكى ڕوون و ئاشكرا لە لايەن CADB,201 – ەوە متمانە بە چاپێكى زووترى دەقەكە دەكرێت).

هەر لە کاکومەوە، بەلکو لە شاخەکانی رۆژهەلاٌتیشەوە، هەروەها گروهەکانی دیکەی وەك گوتیەکان ،، پاسەوانەکانی سویس ،، وەك سەرباز کۆکراونەتەوە.

ئەگەرێکی دیکە، بە روانین لە بێجێوو رێی کاکمییەکان و گروهەکانی دیکەی رۆژهەلاٌت لە ئەنجامی شالاٌوەکانی حامورابی بەرەو باکوور ( cf. charpin 1992 b)، ئەوەیە کە بە شێوەیەکی سادە ئەم گروهانە بە بێ وەستان لە باکووری میسۆپۆتامیادا گەڕاون و سوڕاون —وەك خەباتوم (بروانە) : (.Eidem 1996, and Eidem n.d).

لە بەر ئەوە سەبارەت بەکاکموم دەگەڕێنەوە سەر سەرچاوە کۆنترەکان بۆ ئەوەی لە شوێنەکەی بکۆلٌینەوە . (دەقەکانی گروپیB ) ئاماژە بەوە دەکەن، کە کاکموم و قەبرا سنوورێکی هاوبەشیان هەبووە، وا دیارە کاکموم لە رۆژهەلاٌتی قەبرا و ئەراپخا دابنێن.

دەقەکانی شمشارە زیاتر پێوەندییەکی نزیك بە ئەخازوم لەسەر زێی بچووك پێشاندەدەن، هەروەها کاکموم دەبێت ئەو هێرشانەی لە نەمەر و نیکوم و عیلامەوە هێنراونەتە سەری بە ئاسانی پێی گەیشتبێ .

ئەم زانیارییەی دواتر رەنگە لە چاودا پشتگیری شوێنی باشووری کاکموم — بکات، نەك وەك پێشتر لە،، باکووری دەشتی رانیە،، دا پێشنیارکراوە (Eidem 1985,97n.68).

هەرچۆنێك بێت دوا ئاماژەدان لە دەقەکانی شمشارەدا ئەوە پێشاندەدا کە سنووری باکووری کاکموم دەبێت زۆر لە هەرێمی (رانیە) دوور نە بووبێت.



بەکورتی شوێنێك لە دۆلٌەکانی نێوان (چەمچەمالٌ و سلێمانی)دا پێدەچێ لەسەر بنچینەی بەلٌگەکانی ئێستا دا باشترین چارەسەر بێت.

پرسێکی سەرنج راکێش پێوەندی نێوان کاکموم گوتیوم —ە .

ئەو دەقانەی لێرەدا بلاٌوکراونەتەوە، هەروەها چەند ئاماژە پێدانێکیش لە وانەی (ماری)، ئەوە پێشاندەدەن، کە کاکموم چەند جارێك لەگەلٌ گوتییەکاندا چۆتە رێزەوە، هەروەها گەر شوێنی کاکموم راستبێت ، ئەوا لە رووی جوگرافییەوە لە ولاٌتی گوتییەکان نزیکبووە (cf. zadok 1994, Ag).

موشکەوی پادشای کاکموم وا پێدەچێ نێوێکی خوری لێبووبێت[6].

## شیمورووم و نەمەڕوم و نیکوم

شیمورم لە سەردەمی سارگۆن و بنەمالٌەی ئوری سێیەمدا دەولٌەتە شارێکی گرنگ بووە، بەلاٌم وەك زۆرێك لە دەولٌەتەکانی دیکەی رۆژهەلاٌتی میسۆپۆتامیا لە کۆتایی سەردەمی بابلی کۆندا لە تۆمار وندەبێت ·(cf. Astour 1987, Ao).

لەگەل ٚ ئەوەشدا زۆربەی ئاماژە پێدانەکانی نێو سەرچاوەکانی بنەمالٌەی ئوری سێیەم شیمورووم وەك گرنگترین دەولٌەت لەو هەرێمەی پێی گوتراوە، سنوری خوری،، دەردەخەن.

[6] لەسەر بنچینەی فرمانی muš بنیادنراوە، کە لە نێوە خوریەکاندا گەلێك زۆرە.نێوە کەسییەکە بەmu-uš ka-pl دەنووسرێت، گەر بە موشکە بوو muškaju بخوێندرێتەوە بەمانای،،یەکێك لە موشکی،، یەوە، دێت ، بەلاٌم پێوەندی نێوان پیاوەکەمان و فریگییە کۆنەکان، موشکی(Rölling 1997)، زۆر پێناچێ.

واتە کەوانی دەوڵەتە شارەکانی خودان  فەرمانڕەوایانی خوری بوون لەدەوروبەری ڕۆژهەلاٚت و باکووری ڕۆژهەلاٚتی میسۆپۆتامیا دا، کە فەرمانڕەوایانی ئوری سێیەم چەندین جار لەگەڵیاندا جەنگاون بە یەکیانداداوە (بڕوانە131-131 ,Hallo 1978,potts 1994).

هەرچۆنێك بێت، ئەوەی زەحمەت بێت دیاریکردنی کرۆکی رووبەرەکەیەتی.

هەر بەم نزیکانە فراین (Frayane) ئەوەی خستە ئەنجام، کە دەبێت لە هەرێمی دەربەندیخان بۆی بگەڕێین (frayane 1997,104) کە وا دیارە بە تەواوی شیاو بێت.

چەند زانیارییەکی زۆرکەم سەبارەت بە شیموروم لەم ساڵانەی دواییدا دەرکەوتن.

نووسینەکانی زابازۆنا — ی شیموروم (کوڕی ئیدین سین )، کە لە بێتواتە لە باکووری دەشتی رانیە دۆزراونەوە (-Frayane 1990,707 716) تێکشکانی شارۆچکەیەك بە نێوی (کولونوم) یاد دەکەنەوە، پێدەچێ کەوتبێتە نزیکی بێتواتەوە.

هەرچۆنێك بێت ڕەنگە نووسینەکان متمانە بەهێزی پێوەند شیموروم ببەخشن و سەر بە گروهی سەرچاوە بچووکەکانن، کە کێشمە کێشمی ناوخۆی زاگرۆس وەسف دەکەن، هەرچۆنێك بێت گرنگترینیان نوکرەکراو (relief)- ی ئانوبانینی و نووسینی سەر — ی —پوڵ( Frayane 1990,704-706)-ە. لە دەقەکانی شمشارەدا شیموروم چەند جارێك باسکراوە . یاشوب — ئادو — ی ئەخازوم بۆتە هاوپەیمانی شیموروم ( 1



and 2)هەروەها نێردراوەکان  لەوێوە بە نێو شمشارەدا بە ڕێگەدا بۆ کونشوم هاتوونە (6A).

پادشایەکی  بیٚ ناوی شیموروم دەردەکەوێت، بەلاٚم قسەکەری ( 69)... Tu —ی ناسراو کاندیدێکی شیاوە.

پازدە ساڵێك دواتر پادشایەکی بیٚ ناوی شیموروم لەگەڵ زازیا — ی توروکوم — دا دەربەدەر بوو، بەلاٚم وەك پەنابەر خۆی دایە دەست پادشای گوتیوم (ARMT XX VI/2 4gl, quoted below ch.7).

پێدەچیٚ پێشتر لە سەردەمی ئێمەدا شیموروم بوبێتە عایدی گوتییەکان.

هەردوو ولاٚتی نەمەڕوم (نەمەڕ) ونیکوم، کە لە(69)-دا  داوای هێرشکردنە سەر کاکموم دەکەن، هەمیشە دەکەونە هەمان هەرێمەوە، بەلاٚم زیاتر بەرەو باشوور. هەربەم نزیکانە کێسلەر(1998) پێشنیاری کردووە نەمەڕ لە هەرێمی خانەقین، یاخود تا ڕادەیەك بە نۆرە لەو پەڕی ڕۆژهەلاٚتدا، بە بڕینی سنووری ئێرانی .

سەبارەت بە نیکوم فراین شوێنێکی لەسەر ڕووباری دیالە گەورە پێشنیار کردووە.

پادشانشینەکە بە نەداری بەڵگەدارکراوە، وەلیٚ فەرمانڕەوایەکی سەردەمی ئەکەدی کۆنی نیکوم بە نێوی کەڕشوم (خزمەتکاری نەرامسین) چەند نووسینێکی تایبەتی بۆ بەجێهێشتوین ( Frayane 1993,166ff)، هەروها نیکوم بە یەکەوە لەگەڵ (هالمان)  لە دەقێکی دەسپێکی سەردەمی بابلی کۆنی ئەشنونا — دا باسدەکرێت ( whiting

1987,no.2). نێوی پادشای نیکوم داسی (Dâsi)، کە لە (69)-دا باسکراوە (da-a-si)، داتاشرانێکی نادیاری هەیە، بەڵاّم پاشماوەی فەرمانڕەواda-a-siی-ی ئەنشان —ی ئوری سێیەمە .( cf. stolper 1982, 50).

### ٣- پادشانشینەکانی زاگرۆس

دواین ئەو ناوچەیەی عایدی هێڵەکانی زاگرۆسی ناوەوە و دۆڵی نێوان شاخانە (inter montane)، کە ئەو کێشمە کێشمەی تێدابووە لەسەر ئەرشیڤەکانی شمشارە رەنگی داوەتەوە، بەشە بنچینەییەکانی باکوور — باشوور-ی وەك توروکوم — گوتیوم —عیلام دەخاتە بەردەست. بە تایبەتیش نامە گرنگەکانی ٣٦و ٦٣و ٦٤ بەڕوونی پێشانی دەدەن چۆن ئەم کێشمە کێشمە فشاری هێناوەتە سەر پادشانشینانی توروکی، کە لە دوایدا پشتگیری لە شوروخ دوخ-ی عیلام وەرگرت.

لە هەمان کاتدا پادشانشینی چوارەم، هی لولبییەکان، دەتوانرێ لە نزیکی یان لە دەوروبەری هەرێمی شمشارەدا ببنێرێ، کە ئوپراسیۆن دەکات.

#### توروکوم

پێش دۆزینەوەی ئەرشیڤەکانی ماری و شمشارە و رێماح ئەم رەگەزە (ethnicon) زۆر بە نەداری دۆکومێنتکرابوو، تەنانەت تابە ئەمرۆش دەگات تەنها سێ ئاماژەپێدان بە توروکوم یاخود تورکیان لە دەرەوەی



دەقەکانی بابلی کۆندا هەن ، بە شێوەیەکی روون بەرچاویش تەواوی ئەمانە لە یەکتری جیاوازن[7].

دواجار توروکوم چی بوەو، توروکییەکانیش کێبوونە ؟ تا وەکو ئەم دواییانەش سەرچاوە بلاّوکراوەکانی ماری وایان دەنواند، کە کۆمەڵە گروهێکی گەرۆك بوونە و جەنگی پارتیزانی (guerilla) یان لە دژی شار و پادشانشینەکانی باکووری دەشتی میسۆپۆتامیادا ئەنجامداوە، هەروەها زۆرترینی لێدووەکان (commentator)دوای رووپێوێکی زووینەی بەڵگەکان کەوتوون (Klengel 1962)، هەروەها ئەوەیان

[7] ئاماژەپێدانی یەکەم گێڕانەوەی ریوایەتێکە لە لایەن ئەدەد- نیراری یەکەم، کە ئارێك-دێن-ئیلی باوکی،، ولاّتی توروکو و ولاّتی نیگمخەی بەتەواوی،،داگیرکرد،، ( Grayson 1987,132;cf.shA 2,53 n.42). هەروەها ئاماژەپێدانەکانی دیکە لەبەشێکی سەرەکی دارِشتنەکانی پێوەند بە پادشا نێوداڕەکانی ئەکەدییەوە هاتوون، هەروەها لەوەی پێی دەگوترێ،، جوگرافیای سارگۆن،، دۆزراونەتەوە (Grayson 77-1974,)، هەروەها لە،، گولا- ئان و حەڤدە پادشا لەدژی نەرام-سین،،-دا بینراونەتەوە.

دوا دەق هی بەشێکی سەرەکی دارِشتنێکە بەندیوارە بە شۆرشی گەورە لە دژی نەرام-سین(برِوانە:Goodnick-westenholz 1997 )، کە لەسەردەمی بابلی کۆندا دانراون، هەروەها باسکردنی چەند پادشای چەند ولاّتێکیش لە رۆژهەلاّتدا هەیە:( Mari version;A.8696,6,charpin 1997 ) پەشەخنەدگەلنی لولوبو،( Geneva Version) پوتی-مەتەل-ی شیموروم، ئینگی مات نەمەرِ(mät namar);( Gula-an and seventeen kings) گولا-ئان-ی گوتیوم،(...)-ئێل-ی کاکموم،(...)-ئا-ئێل-ی لولوم،.....ئی) ئی-ئان-ی توروکوم. لیستی دوژمنەکان لەم دەقانەدا دەگورِێت، هەروەها رەوشی پەرەسەندنی مێژوویی جیا لەئەفسانە(historicity)-ی هەر پادشایەکی تایبەتی دەبێ بەجێی گومان وەریگرین، بەلاّم هێندێك لەمانەی سەرەوە دەبێ هەبووبن و لە ئاخیر و ئۆخری هەزارەی سێیەم یان سەرەتای هەزارەی دووەمی بەر لەزایندا فەرمانڕەواییان کردووە.

گریمانکردووە، کە توروکییەکان  تیرەی شاخاوی نیمچە کۆچەر بوونە و لە لایەن گروهانی زمان خورییەوە سەرکردایەتیان کراوە.

بە شێوەیەکی نموونەیی لە سەرچاوەی کارە ستانداردەکاندا توروکوم دەبینین وەك،، کۆچەری دیجلە (Nomadenstamm ödes Tigris)،، لێیاندواون (Groneberg 1980,241)، یاخود،، دانیشتوانی شاخاوی زاگرۆس" "Kupper )population montagnarde duzagros ARMTXVI /1,36)، ژمارەیەك  زاناش ئەم  نواندنەیان بە شێوەی گفتوگۆکردنی گشتیتر وەك لاندسکەیپێکی کۆمەلاّیەتی میسۆپۆتامیا بەکارهێناوە.

هەروەها (Routon) لە گفتوگۆیەکدا بە نێوی،،سەرکردایەتی دوورەdimorphic chiefdom،، ئەوە روونەدەکاتەوە، کە:،، سەرکردایەکی لەم جۆرەمان لە بناری زاگرۆس دا هەیە، کە هی توروکییەکانە لە باکووری رۆژئاوا (sic:) —ی ولاّتی ئاشووردا;

لەگەلّ ئەوەشدا هێژ ناتوانین دلّنیابین  لەوەی، کە کامە شارۆچکەیان وەك سەنتەری تیرەیی رۆلّی گێڕاوەو پایتەختی نەو چڕکە کەیان(dynasty)کامە بووە،، (Rowton 1987,373).

کلینگل بە هەمان  شێوە (1985) لە  وەرگێڕانێکی (کۆپیەکی ) نوێی روپێوە ئەسلّیە ئەوەی گریمانکردووە، کە توروکییەکان گروهێکی جیاوازی تیرەیی نیمچە کۆچەر بوونە، کە پێوەندی جودا جودایان لەگەلّ گوند و شارۆچکە جێگیرەکان  و خەلّکە نیشتەجێبوەکان لە گردە بنارییەکانی زاگرۆسدا بەست.



هەنوکە دەتوانرێ تەواوی ئەم گریمانانە لە بەرامبەر بەلّگەکانی شمشارەدا تاقیبکرێنەوە هەروەها ئەم بەلّگانە ڕوونببنەوە بۆ راستکردنەوەی هێندێك لە یەکتر تێگەیشتنی هەلّە، کە دەربارەی کۆمەلّگەی زاگرۆس بە کاردەهێنرێن[8].

لە دەقەکانماندا بەراوردێك لە نێوان بڕگە هاوڕێکەکانی (2 and 1)- دا، کە لە شەمشی ئەدەد — ەوە نێردراوە، ئەوە ڕووندەکاتەوە، کە کواری وهاوڕێکانی بە توروکی داناون، چونکە دەقی دواتر،، ئێوە،، - ی پێشو لەگەلّ (lū ti-ru-ki-i) دا دادەنێت.

ئەمە دەقە پێوەندییەکی جێگیر لە نێوان رەگەزە ناروونترەکانی زاگرۆس و زانیارییە دوور و درێژەکانی دەربارەی دەولّەتە تایبەتییەکانی لە شاخەکاندا هەن، بەدەستەوە دەدات، چونکە کواری دەتوانێ پێوەندی لەگەلّ ئاسۆیەکی جیۆ- سیاسی فراوانتردا بکات، کە دەبێت بە تەواوی

[8] Cf.klengel's conclusion that,, Die Turukäer gehörten offen bar zu jenen hoch spät- gentilen Gruppen, bei denen durch einen engen, teilweise durch ökonomische zwênge hergestellten kontakt zu der stattlich organisierten, in der Rania – ebene und im zagros – vorland Regan feldbau betreibenden Bevölkerung, die urge sellschaftlichen Verhêltnisse bereits verfielen und stammes fûhrer eine permanente Funktion a,,(klengel 1985,256),usûbten

کە لەراستیدا تیشك دەخاتە سەر دوا قۆناغ لە مێژووی توروکییەکان لە سەردەمێکی کۆندا، بەم پێیەش پەرەسەندنە سوسیۆ-سیاسییەکان بە پێچەوانەوە وەسفدەکات.

هەرێمێکی گەورەی لە شاخەکان و شمشارەش گرتبێتەوە وەك بنکەیەکی پێشەوەی  رۆژئاوا.

پێدەچێ بە هێزترین پادشانشین ولاتی ئیتەبەلخوم (یان بەشێوەکی سادە1 1 Itab/pal,cf.below,sea) بوویێت، کە پادشاکەی پیشێندن بووە.

شوێنی چاپی مۆرەکەی (seal impressed) لەسەر بەرگی نامەی69 (seal 1) ئەم نووسینەی خوارەوەی هەیە: ،،پێشێندێن، کوڕی توکوتی، پادشای ولاتی ئیتەبەل، وەچە خەرەوە (begetter)-ی تەبیتو،،.

نووسینی مۆرێکی دیکە نێوی بابەگەورەی پیشێندن دەدات (seal 3):

،،توروکتی، کوڕی ئوشتاپ — شاری، پادشای ئیتەبەل، داگیرکەری دوژمنەکانی، باوکی ئاد - سەرەڕای گۆڕانی گرافیکی لە نێوان هەر دوو نووسینەکەدا رەنگە بە متمانەوە بتوانین توروکتی بە باوکی پیشێندن هاورێك بکەین.

نێوەکەی پرسی (کێشەی) ئەگەری پێوەندی بە رەگەزی توروکو (ئوم)دەخاتەوە ،کە هەر یەکەیان پێدەچێ لە سەر بنەمای گریمانی  وشەی توروك — ی خوڕی بنیاد نرابن. پێدەچێ  شیاوبێت. کە نازنێوێکی ئیپۆنیمی بێت (بڕوانە پێشتر بەشی ب :cf. The case ofJailanum )، هەروەها دەکرێ  لەوە رابمێنین، کە ئیتەبەلخوم  لە رێگەی ژێر بارخستنی (exploit) توروکتی — یەوە وەك پادشانشینێکی دەستەلاتدار لەبەر ئەم هۆیە نێوەکەی بۆ ئاماژەپێدانی خەڵکی ئەوێ بەکارهێندرا بێت.



کۆنترین بەکارهێنانی (ethnicon) پازدە ساڵێك دەگەڕێتەوە پێش ئەرشیڤەکانی شمشارە. لەو سەردەمەدا یەخدوم — لیم — ی ماری لە خابووردا تێکشکاند و جل و بەرگی بەنرخی بۆ تەزیگی پادشای توروکوم نارد (charpin 1994 b, 198,no.112.2-3:ta-zi-gi,Lugal tu-ru-huî-uki). ئەمەش پێدەچێ تێوری ئەوەی تایبەت کردبێت، کە باوکی پیشێندن  بەرپرسی ئیتنیکۆن —ە کە بووە.

گەر تەزیگی ئیتە بەلخوم بوویێت، دەبێ پێشینەیەك(باوانێك) —ی توروکتی بوویێت، وەلێ تەواو پێدەچێ ئەو پادشای دەوڵەتێکی دیکە بوویێت لە ناوچەکانی توروکیاندا.

هەرچۆنێك بێت پێدەچێ  ریزبەندی کەمتر لە سێ پادشای ئیتەبەلخوم — مان نەبێت.

لە هەردوو نووسینەکەدا نێوی کوڕی پادشاکان پێدەچێ میراتگری شەرعی (heir apparents)- بن.

سەبارت بە توروکتی کوڕەکەی لەگەڵ پیشێندن — دا هاورێك نییە، هەروەها ناشتوانرێ لەگەڵ کەسێکی دوکومێنتکراوی شوێنێکی دیکەدا هاورێك بکرێت.

پێدەچێ ئەو زووتر مردبێت ، یاخود لەلایەن پیشێندنەوە پشتشکێن (out manoeuvrad)کراوە، لەلایەکی ترەوە، تەبیتو-ی کوڕی لە رۆڵێکی جێبەجێکاریدا کەم بەڵگەیە (٦٤).

هێژ نووسینی مۆرێکی دیکە (seal 4) بۆکەسێکی دیکە دەگەڕێتەوە، کە،، خزمەتکرا،،

(؟)-ی توروکتی بووە، ئینجا چ ئەمە و چ ئەو راستیەش، کە مۆرەکەی توروکتی بە شێوەیەکی رەها بەکارهێندراوە کاتێك پیشێندن وەك پادشا چالاك بووە، پرسێکی دیکەی زەحمەت دەخاتەوە.

بەداخەوە شتێکی موستەحیلە پارچەکانی بەرگی مۆری توروکی — یان لەسەرە لەگەڵ نامەیەکی تایبەتیدا بگونجێندرێن (cf.Notes to the text)، هەروەها ئەوەی لە بەردەماندا دەمێنێتەوە چەند روونکرنەوەیەکی شیاون.

پێدەچێ توروکتی هێژ لە ژیاندا بووبێت یان کەمێك پێش ئەم کاتە لە ژیاندا بووبێت ؟ پێدەچێ مۆرەکەی لە لایەن پیشێندنەوە دووبارە بەکارهێندرابێت و لەیەك کاتدا بۆ خۆی بەکاریهێنابێت ؟ یا ئەوەتا پێدەچێ دەستەلاتێکی هاوبەشی پادشا هاوچەرخەکان لە ئیتەبەلخوم —دا هەبووە — پیرۆی ئالۆزی لە حکومەتی عیلامیدا بەکارهێندراوە دەخاتەوە یاد(cf. below)؟

ئەم نادڵنیابوونانە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا ئەوە پێشاندەدەن چۆن زانیارییە سنووردارەکانمان و تێڕامانی زیاتر لەم دەمەدا بێ سوودن.

لەبەرئەوە دەبێت بۆ ئاستی دواتری دەستەلات بگەڕێینەوە، کە خودی تەلپوش — شاری و کواری گێڕاویانە.

ئەو تەلپوش —شاری —یە بە شێوەیەك لە شێوەکان ملکەچ بووە بۆ پیشێندن لە نووسینی مۆرەکەیدا دەربیچوێنی (seal 2)، لەو



راستیەشەوە پیشێندن خۆی بە،، باوك،، نازنێوکردووە، لە کاتێکدا تەلپوش —شاری نازنێوێکی ،، بێلایەن،،-ی بەکارهێناوە، کە لە پێشەکییەکەدا خۆی لە هەر زاراوەیەکی خزمایەتی (یان نەسەب) دوور خستۆتەوە، کاتێك هەردووکیان ئەو و پێشێندن نامەکانیان بۆ یاشوب — ئادو —ی ئەخازوم نووسیوە.

لە لایەکی ترەوە، ئەوە روونەبێتەوە، کە خودی تەلپوش — شاری پێگەیەکی بالای هەبووە، چونکە دەبینین بەشداری لە پۆپەی شاهانە (Royal Summit)- دا بکات و توانیویەتی پەیماننامەیەك ببەستێ (٦٣)، و پێشەوایەتی ولاتەکان (٥٩) و سوپاکان (٥٤) بکات. وا دیارە تەلپوش — شاری لە هەمان ئەو ئاستە سۆسیۆ-سیاسیەدا بووبێت، کە کواری هەیبووە، چونکە خۆی وەك ،، برا،، پێشانداوە یاخود نازنێوێکی،، بێلایەن،، ی بەکارهێناوە، وەلێ یەکیەتییەکەیان دەبێت وەك بەشێك لە سیستەمێکی فەرعی پیادەکردبێت، کە پەیامنێری ناوچەیی دیکەشی لە نێوخۆ گرتووە.

هەروەك رەنگە دواتر پێشانبدرێت (ch.A.A) دەتوانرێ برێکی زۆری ئەم نامە ناوچەییانە بە هاوچەرخ دابندرێن ،، sets ،، واتە ئەو گروهە نامانەی لە یەککاتدا لە لایەن پەیامنێرە جوداکانەوە نێردراون.

ئەمەش بە یەکەوە لەگەڵ بەڵگە فیزیکییەکانی لە خشتە راستەقینەکاندا هەن (below ll.1.B) رێگەمان دەدەن پیشێندن و تەلپوش — شاری و سێ پەیامنێری ناوچەیی دیکەی گرنك : شێپرەتوو و سین- ئیشمێ ئانی

و خولوکەدیل ئەنجامگیر بکەین، کە بە شێوەیەکی سەرەکی هەموویان کەوتوونەتە هەمان شوێنەوە.

تەواوی ئەم توخمانەش لە روونکردنەوەی زانیارییەکانی خوارەوەدا هاریکاری دەکەن لە هەریەك لە (34 and 35) — دا سین — ئیشمێ ئانی بە شێوەیەکی باش بە کواری رادەگەیەنێ:

| ٣٥ | ٣٤ |
|---|---|
| پادشا | سەروەرت |
| شاری کونشوم | ولاَت |
| براکەت | براکەت ئەوەی تۆی خۆش دەوێ |
| ماڵەکەت | ماڵەکەت |
| ژنەکەت | شیپ — شەڕی ، خزمەتکارت |
| کوڕەکانت | منداڵەکان، کوڕەکانت |
| منم ئەوەی ئێوەم خۆش دەوێ | من ئەوەی ئێوەم خۆش دەوێ |

پادشا ،،سەروەر،،- ی کواری، جگە لە پیشێندن کەسی ترنییە، پایتەختەکەشی دەبێت کونشوم بووبێت.

وا پێدەچێ ،،برا،، ی خۆشەویستیش یان تەلپوش —شاری یان شێپڕەتوو بووبێت. سین — ئیشمێ ئانی بە شێوەیەکی بێ فیزانە خۆی دەخاتە دوایی، وەلێ پێدەچێ نزیکترین پێوەندی کەسی لەگەڵ کواری — دا هەبووبێت.



زانیارییەکانی نامەی (٦٣) ئاماژە بەوە دەدەن، کە کواری پێشینە راستەوخۆکانی نێونیشانی mû/uldānum-یان بە دەستهێناوە، کە وشەیەکە راڤەکردنێکی جێی گومانی هەیە، بەلاّم پێناچێ نێونیشانی شاهانە بێت (cf. Eidem 1990). لە (aon.36) shA 2 — دا ئاماژە بەوە دراوە، کە وشەکە لە رەگی،، walādum،،منداڵ دەخاتەوە،، داتاشراوە (cf. Durand 1996,380 f)، کە هەروەها لەدوا دێڕی خەرتوشە (چوارچێوەی مۆر-legend-cartouench)—ی مۆری پیشێندن-یشدا بەکاردەهێنرێت.

هەر چۆنێك بێت، وا پێدەچێ بیرێکی ئاوەها بە باشی پڕ بە پێستی ناونیشانەکە بێت.

پۆستی کواری لە شمشارەدا وەك جۆرێك لە،،سەرەوەری کشانەکان،،بووە، بە شێوەیەکی ئەزموونیش پێدەچێ (muldanum) بە،، دیوك ،، وەربگێردرێ.

گەلێك سەرنج راکێشە چەندین ساڵ دواتر ئەوە بدۆزینەوە کە توروکییەکی دیکە، زۆر پێدەچێ پادشای توروکییەکان بێت هەمان ئەم ناوونیشانەی هەڵگرتووە، دەگەڕێینەوە دواتر (بڕوانە :ch7).

پیشێندن، نامەکان بە رێگەی شمشارەدا دەنێرێ، بە شێوەیەکی روون و ئاشکراش راستەوخۆ پەیوەندی بەکوارییەوە نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا بانگەشەی ئەوە دەکات، کە سەروەری کواری ،،ئەوەی وەك ژیانی خۆی خۆش دەوێت،، (٦٣)، ئەو تیۆرە زۆر پێچوەش، کە دەتوانرێ پێشکەش بکرێت ئەوەیە تەلپوش — شاری و کواری و هتد. چوونەتەوە سەر

خێزانێکی لالقێکی شاهانە، یان لەوانەیە هاوپەیمانی زۆر نزیکی ئەوە چرکێکی میرانە بووبن.

کاتێك هەریەك لە تەلپوش — شاری و پیشێندن بۆ یاشوب — ئادوی ئەخازوم دەنووسن تا رازی بکەن دۆستایەتی بهێلێتەوە، تەلپوش —شاری داوای لێدەکات لەگەڵ،، ئەم ماڵ و ولاّتی ئیتە بەلخوم —ە دا،، راستبێت .(٦٦)

ئەو لێدوانەی ئاماژە بەوە دەدات، کە تەلپوش-شاری نوێنەرایەتی بنەماڵەیەکی نێوداری کردووە، کە لەوەی پیشێندن جیایدەکاتەوە.

بە هەرحاڵ شتێکی گرنگە ئەو چالاکییە سەربەخۆ بەرچاوەی، کە تەلپوش — شاری وکواری هەیانبووە، جەخت بکرێتەوە. بە پێچەوانەی فەرمانڕەواکانی یان کاردارەکانی نموونەی وەك شەمشی — ئەدەد، یان یەسمەخ —ئەدوو،یان زیمری — لیم، کواری ئەرك و فەرمانی راستەقینەی وەرنەدەگرت، وەلێ بە زۆری لە لایەن خانەدانەکانی و ئەندامانی خێزانەکەیەوە ئامۆژگاری دەکرا و هاندەدراو داوای لێدەکرا.

دەقەکان جگە لە ئیتە بەلخوم ئاماژە بە دەوڵەتی دیکەش دەدەن، بەلاّم درێژەی گەلێك کەم دەخەنە بەردەست. لە(٦٣) — دا یەکگرتنێکی گەورە لە دژی گوتییەکان دروستدەکرێت، کە ولاّتانی ئیتە بەلخوم و کوسەنەرخوم و زوتلوم و شودە مێلوم تێوەی دەگلێن، هەروەها هەمان دەق نێوی چەند نوێنەرێکی دیاری ئەم هەرێمانەمان دەخاتە بەردەست: پادشا نەشومەرِ- ی کوسە نەرخوم و کوڕەکانی تەروگورو شورتی،



جەنەڕالی زوتلوم یێردیگێندای، هەروەها کیگیزارا-یەکی دیاریکراو، پێدەچێ پادشای (زوتلوم) بێت.

ئەوە گریماندەکرێت، کە ئەم ولاّتانە لە رووی ئیتنێك و پێکهاتەوە زۆر لە ئیتە بەلخوم چوونە، لەگەڵ ئەوەشدا گرنگییەکی سیاسی و هەرێمی جیاوازیان هەبووە.

ئەو راستییە بە دەستەوە دەدات، کە ئەوان لە دژی گوتییەکان ریزیان بەستووە و درێژبوونەوە (پلانەکە) و ئەسڵی سروشتی کێشمەکێشمەکە شیان داوە، ئێمەش رەنگە لە گریمانکردنی ئەوەدا راستبین، کە ئەم دەوڵەتانە بەلایەنی کەمەوە لە تێڕوانینی ولاّتی خواروی میسۆپۆتامیادا بە توروکییەکان دانراون.

بەم پێیە بنچینەی وەلاّمێکی پرسیارەکەمان هەیە ،،توروکییەکان کێبوونە، واتە گروهی کۆمەڵە پادشانشینێك لەدۆڵەکانی باکوری رۆژئاوای زاگرۆسدا، بە زۆریش پێکهاتەی خوری بوونە. گەواهی ئەوە هەن ئاماژە بەرێکخراوی سیاسی تەواو تالۆز بدەن لەم دەوڵەتانەدا، کە خودان پێڕۆی نەژادە نێودارکان بوونە لە هێزی هەرێمیدا بەشداریان کردووە.

هەرچۆنێك بێت، پرسیاری دووەم ئەوەیە چۆن نزیککردنەوەی جوگرافیایی سەبارەت بە هەرێمی کرۆکی پادشانشینەکانی توروکی بخرێتە بەردەست.

بە داخەوە لە دەقەکانماندا هیچ نێوێکی جوگرافیایی پێوەند بە هەرێمی زاگرۆسی توروکیان وا باس نەکراوە بتوانرێ تا رادەیەك بە دڵنیاییەوە جێگەی دیارییبکرێت.

ئەو نێوەی وا دیارە گرنگترین پادشانشین بووبێت، واتە ئیتە بەلحوم، لە دەرەوەی دەقەکانی شمشار (و ماری) — دا دەرناکەوێ، هەروەها هەمان شت سەبارەت بە نێوی،،ولاتەکانی،، وەك زوتلوم و کوسە نەرخوم و شودە مێلوم، یان شارۆچکەکانی وەك ئەلیای[9] و ئەردەمێکوم و ئیلەلەی وسەشخەرشوم و زوکولا، راستە (واتە هەمان شتیان بەسەردا جێبەجێدەبێت).

هەرچۆنێك بێت، دەتوانرێ دوو هەلاۆێرەکردنی شیاو تێبینی بکرێن:

یەکەمیان شارۆچکەی ئارونوم — ە، کە بە شێوەیەکی ئاشکرا بۆتە هاوپەیمانی گوتییەکان (cf.63) و لە دەقەکانی سەردەمی کاشیشدا ئاماژەی پێدەدرێ، وەلێ لە پێڤاژووەکاندا بۆ دیاریکردنی شوێنەکە هاریکار نییە[10] .

دوەمیان خودی شارۆچکەی کونشوم — ە، کە دەکرێ بە شێوەیەکی کاتی بە ولاتی کونزوخی/ کوشوخی — یەوە پێوەند بکرێت، کە لە بەلگەنامەکانی نوزی— دا دەرکەوتووە، هەمیشەش یەکسانبووە بە ولاتی کاشییەکان.

وا دەردەکەوێ ئەم ولاتە دانەوێلەی هاوردبێت و ئەسپی ناردبێتە دەرەوە (بڕوانە :.Fincke 1993,160 ff) دوای دێڕێکی بەدوا داچوون (پرسیار)

---

(9) ما ئەلەییە(MA Alaja)(؟) بڕوانە:.Nashef 1982,10 .

(10) بڕوانە: LaessØe 1959 ai 85 and 20,and nashef 1982,39 s.v. Arunaju.



دەکرێ تێبینی بزووتنەوەکانی نێوان شمشارەو بەشێکی کرۆکی ناوچەکانی دەوروبەری شارۆچکەی کونوشوم، بەم شێوەیە وەسف دەکرێن لە شمشارەوە ،،دەچێتەسەرەوە،،

(-3,6,11,14;64,36,40,64;63,44,52;59,12,33;58,13;53,39;4g,10 elûm)، وەلێ لە کونشوم —ەو،،بەرەوخوارەوە،، (56,39-warādum). کاتێك هاوڕێکانی کواری لە کونشوم — دا بەدوای بزووتنەوەکانی شەمشی — ئەدەد لە ماوەی شالاۆوەکەیدا گەڕاون، کە لە دژی ئەراپخا و قەبرا دا ئەنجامیداوە، بە شێوەیەکی بەرچاو دەبێت ئەوان ئەم کارەیان لە رێگەی شمشارەوە بەجێگەیاندبێت (63 and 64).

ئاماژەپێدانە پێشنیارکەرەکان هەروەك ئەم زانیارییانە بەدەستییەوە دەدەن سنووردارن.

کەمی (نەبوونی) ئاماژەپێدانەکان بە ناوچە جوگرافیاییە بەندیوارەکان بە بابەتەکەوە ئاماژە بەوە دەدات، کە کرۆکی هەرێمی توروکیان تەواوێك لە شانۆی میسۆپۆتامیا دوور بووە، ئەمەش چەسپاندنێکی گشتی لە دەقەکانمادا دەبینێتەوە، کە وا دەرناکەوێ بەتایبەتی کواری لە بنکەکەی نزیك بووبێت.

ئەو راستیەی، کە رێگە لە شمشارەوە بۆ ئەوێ بەرەو،، سەر،، دەچێت، بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا ئاماژە بەوە دەدات، کە هاتووچۆ بەرەو سەرەوە بە نێو شاخەکاندا بووە و بە شێوەیەکی ئاشکراش ئەمە بەکارهێنانێکی باوی فرمانی (elûm)- ە .

دەقەکانی سەردەمی ئاشووری کۆن نموونەیەکی باش بەدەستەوە دەدەن، کە چەندین جار لە بارەی،، بەرەو سەرەوە،، بۆ ئەنادۆڵ و،، بەرەو خوارەوە،، بۆ ئاشوور دەدوێن[11].

لە کۆتایدا دوا سەرنجی پێشو وا دەردوکەوێ هەرێمی باشوور/باشووری رۆژهەلاّتی رانیە تایبەتبکات، چونکە لێرەوە ئەوە پێویست نەبووە لە رێگەی شمشارەوە هەواڵگری دەربارەی رووداوەکانی دەوروبەری ئەراپخا و قەبرا ئەنجامبدرێت.

گرنگترین رێگە ئەوەیە لە مەهابادەوە دەچێتە سەردەشت، وا دەردەکەوێ لە ماوەی چەرخی ئیسلامیدا رێگە کاروانێکی گەورە بووبێت و مەڵبەندەکانی ئازەربایجانی لەگەڵ بەغداد-دا گرێدابێت.

رێگە نوێکە، کە یەکێك زۆر گوماندەکات رێگەی کاروان بووبێت بەنێو شاخەکاندا پێچدەکاتەوە تاوەکو بەرەو یەکێك لە لقەکانی مەهاباد چای بەرز دبێتەوە.

رێڕەوێك نییە بەسەر ئەم رێگەیەدا تێبپەڕێت (لەگەڵ ئەوەشدا دۆڵی زێ بەرەو شاخەکان بەرز دەبێتەوە )، هەروەها تاکە شوێنی پەڕینەوە (ford) ئەوەی خودی زێ — یە.

---

[11] cf. بۆ نموونە رێکەوتنامەی نێوان ئاشوورو تیل- ئەبنو(Eidem,1991a)، کە بازرگانە ئاشوورییەکان بە لەیلاندا تێپەریوون، وەك،، بەرەو سەرەوە چوون یان بەرەو خوارەوە هاتن،، وەسفی دەکات.



لە رۆژگارێکی رابردوودا گەیشتۆتە مەهاباد بە کێڵگە دەوڵەمەند و رێگە باشەکانییەوە بەرەو ئازەربایجان، تەواوی حەوزی ورمێ — ش بۆ گەشتیاران والاّیە (Leuihe 1974,102).

بێگومان حەوزی ورمێ یەکێکە لە مەڵبەندە سەرەکییە ئاوەدانەکانی زاگرۆس و بەکاندیدێکی باشیش دەردەکەوێ بۆ کڕۆکی ولاّتانی توروکی، بەرێگەی وەلاّتانیش، وا دەردەکەوێ پێشنیارکردنی بەدیلێکی قایلکەرانە زەحمەتبێت.

بەرەو رۆژهەلاّتی ناوچەی رانیە، لە کوردستانی ئێراندا دۆڵەکان تەنگەبەرن و،، ناوچەکەش بەکەمی خەڵکی تێدا نیشتەجێبووە و زۆرینەی ئەم ناوچییەش بۆ لەوەڕگای بەرزاییەکان و کەمێك شتی دیکە لەبارە،،(Levine 1974,100).

لە لایەکی دیکەوە، هەرێمی گردی بناری چ لە باکووری رۆژئاوا چ لە باشووری رۆژهەلاّتی ناوچەی رانیەدا، وا دیارە لە لایەن پادشا نشینە جۆرا و جۆرەکانی لە پێشدا تاوتوێکران داگیرکرابێت و بەپێچەوانەی شوێنە بەندیوارە توروکییەکان لەگەڵ ئەوەشدا بەکەمی لەسەر چاوەکانی ولاّتی خوارووا باسیان لێوە دەکرێت.

شتێکی ئاشکرایە بەبێ زانیاری  نوێ هەوڵدان بۆ هەر پلەیەکی ورد و دروست ،کە بەندیوار بێت بە شوێنی ،،ولاّتە،، جودا جوداکان و موڵکیانەوە، بێ سوودە، بەلاّم شتێکی بێ سوود نییە هێندێك لەو تیل نیشانانەی لێرەدا پێشنیار دەکرێن لێیان بکۆڵرێتەوە.

دەمێکی باشە ئەوە زاندراوە، کە شوێنەکانی باکووری ڕۆژئاوای ئێران لە دۆڵی ئوشنو – سۆلدزی باشووری گۆمی ورمێ جۆرێکی جیاوازی، گلێنەی خابوور، بەرهەمدێنن، هەرچەندە هی سەرەتای هەزارەی دووەم بڕێکی سنووردارە، بە ڕێگەیەك لە ڕێگەکانیش لە کەوانێکی فراواندا بە باکووری عێراق و سووریادا بڵاوبۆتەوە.

یەکەم هاوڕێککراو لە هەڵکوڵینەکانی حەسانلو (چینی ٦) – دا لەلایەن سیکرامەر Hamlin 1971 and ((Kramer)1974,Kramer,1977 – ەوە تاووتوێکراو بڵاوکرایەوە، زۆرترین بڕی مەتڕیاڵەکان لە چینی چوارەم لە دینخە تەپە- دا دۆزرانەوە و مەتڕیاڵی هاوشێوەی ئەمانەش لەسەر رووی شوێنەکانی دیکە دا ناسرانەوە.

بەگوێرەی هەڵسەنگاندێکی تازە سەرجەمی ئەو حەوت شوێنەی گلێنەی خابووریان تێدایە هەموویان لە هەرێمی نێوان ئوشنوو مەهاباددا دەناسرێن (Kroll 1994,165). لەبەر ئەوەی ئەم مەتڕیالانە لە جۆری ناوچەیی سیرامیکی ئێران جیادەکرێنەوە، ئەوە پێشنیارکراوە، کە ئەم ناوچە تایبەتییە لە ماوەیەکی تەواو سنوورداری دەسپێکی هەزارەی دووەمی بەر لە زایندا، دەبێت پێوەندی گەلێکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ باکووری میسۆپۆتامیادا هەبووبێت.

سروشتی ئەم پێوەندییە هێژ روون نەبۆتەوە، وەلێ بازرگانی نێودەوڵەتی، بە شێوەیەکی تایبەت تریش بازرگانی بە نێو بانگی قەلایی (tin) و شەملك (textiles) لە سەردەمی ئاشووری کۆندا، هەمیشە وەك وێچوترین روونکردنەوە وەردەگیرێت .



ئەم تیۆرە لە بەڵگەکانی شمشارەدا کەم ناوروژێندرێ. لە ساڵی ١٩٥٢-دا لاسو نامەی (٦٨) لە لێکۆڵینەوەیەکی جیاوازدا بڵاوکردەوە .

بەڵگەکانی نێو ئەم دەقە، هەروەك نووسەر پێشنیاری کردووە، پێدەچێ ،، سەبارەت بە مێژووی زووینەی کانزاکاری گرنگبن، چونکە ئاماژە بەوە دەدەن، کە(خامەکانی ) قەلایی لە باشووری کوردستاندا فەراهەمبوونە، هەرچەندە کانەکانی کانزای خاویان لێ بەدەستهێندراوە دەبێت لە پشتی زنجیرەی بەرزتری شاخەکانی زاگرۆسدا لێیان بگەڕێین (LaessØe).

بۆیە لە دوایدا قوتابییانی بواری بازرگانی قەلایی بە گشتی دوای ئەم دەرئەنجامە کەوتن و ئەوەیان گریمانکرد، کە بەڵگەکانی شمشارە ئەوە پێشنیار دەکەن قەلایی لە سەرچاوە دوورترەکانی ڕۆژهەڵاتەوە بە ڕێگەی ئەم شوێنەدا تێپەڕێندرابێت، کە لە راستیدا ئەم شوێنە کەوتۆتە سەر هەردوولا (astride)-ی ڕێگەیەکی ستراتیجییەوە.

هەروەك لەلایەن رووپێوێکی نوێی کێشەکەوە دانراوە، کە:

هەروەها دەزاندرێ قەلایی لە باکووری – ڕۆژئاوای ئێرانەوە بە ڕێگەی تەل شمشارە(شوشارا-ی کۆن)-دا تێپەڕێندراوە، کە گەروی سەنگەسەری بۆ نێو دەشتی رانیە گرتۆتەوە(LaessØe 1959).

پێدەچێ لە ویۆە بەڕێگەی هەولێر و کەرکووك دا بەرەو حەوزی دیالە برابێت (Moorey 1994,2,8f).

شتێکی ئاسانە ببیندرێ چۆن ئەم بەڵگانە وەك روونکردنەوە هاوکاری بازرگانی کاریگەریان کردووە بۆ بلاوبوونەوەی گلێنەکانی خابوور و جۆری کەل و پەلەکانی دیکەی میسۆپۆتامیا بەرەو حەوزی ورمیێ [12] .

هەرچۆنێك بێت، جێگەی داخە لەگەڵ ئەمەدا لە یەکتر تێنەگەیشتنێکی بنچینەیی پێوەند بە بەڵگەکانی شمشارە هەیە .

بە چاو پۆشین لە نموونەکانی ماوەیەکی زۆر بەر لە ئێستا بلاوکراوەنەتەوە قەلایی (بە ئەکەدیannakum ) لە چەند نامەیەکی دیکەی ئێرەدا باسی لێوە دەکرێت، وەلێ بەڵگەکان پشتگیری تیۆرەکانی پێشوو ناکەن.

قەلایی لە ئێرانەوە بە رێگەی شمشارەدا نەهێنراوە، بەڵکو لە راستیدا رەوشەکە تەواو پێچەوانەیە، واتە فەرمانڕەواکانی بە شێوەیەکی گشتی لە

(12) لە بلاوکردنەوەیەکی نوێی نێوەڕۆکی گۆڕێکی ئاخیر و ئۆخری سەردەمی بابلی کۆندا لە دینخە —تەپە، نووسەرەکە گەیشتۆتە ئەم دەرئەنجامە: زانیارییەکانی شیکردنەوەی پێکهاتەکانی ئەم گۆڕە دەیانخاتە بەردەست بەڵگەی زیاتر دەربارەی پێوەندی دینخە لەگەڵ تۆڕێکی فراوانی بازرگانی لە چارەکی دووەمی هەزارەی دووەمی بەر لەزاییندا پێشکەشدەکەن.
رۆڵی راست و دروستی دینیخ لەم بازرگانییەدا نازاندرێ. لەگەڵ ئەوەشدا،، درێژبوونەوەکانی،، گلێنەی خابوور لە شوێن و بارستەی گەورەی دیوارەکاندا بینراوەتەوە....ئاماژە بە رۆنداروێکی گەورەی قایمکراوی جۆرێك دەدا، هیچ دەقێك نە دۆزراوەتەوە، هەروەها هاوڕێککردنی دینخە بە کۆلۆنەیەکی بازرگانی ئاشووری، هەروەك کرامە، تێبینی کردووە، جێگەی رامانە. هەرچۆنێك بێ، بوونی هەریەك لە گلێنەی خابوورو جۆرەکانی خشڵی رۆژئاوا بە روونی ئاماژە بە پێوەندییەکانی دینخە دەکات بەرۆژئاواوە بەرۆنان لەسەر بوونی تۆڕێکی بازرگانی ماوە- دوور لەم سەردەمەدا، بوونی ئەم جۆرە مەتریالانە لە دینخەدا دەبێت هی بازرگانی بن،(Robinson 1991,389).



رۆژهەلاتی شمشارەدا بنکەیان داناوە، لە ناوچەکانی رۆژئاوادا بە دوای خاوەکانی قەلاییدا دەگەڕێن: ئەمەش ئەوە تایبەت ناکات، کە بازرگانی قەلایی لە چیاکانی زاگرۆسدا لە رۆژهەلاتەوە بۆ رۆژئاوا هەبووبێت، چونکە دەقەکانی شمشارە سەردەمێکی تەنگژەی جدی لە شاخەکاندا وەسف دەکەن،کە پێدەچێ رێگەی ئاسایی شتومەکەکانی گرتبێت.

هەرچۆنێك بێت، ئەوە دەمێنێتەوە، کە ئەم رێگایانە هێشتا پێویستیان بە بەڵگە بۆ هێنانەوە هەیە[13] .

بە هۆی هەمان نیشانەوە ئەوەی بەدوا دادێت، کە بازرگانی قەلایی وەك روونکردنەوەیەك بۆ بلاوبوونەوەی گلێنەکانی خابوور بە نێو ئێراندا دەبێت تێڕوانینێکی تەواو بمێنێتەوە و ئەو روونکردنەوە بەدیلانەش پێویستە لێیان بکۆڵرێتەوە.

هەروەك دواتر پێشاندەدرێت(ch.s 6 and7) بوویەرە وروژێنەرەکانی لە شمشارەو ماریدا دوکومێنێتکراون، لە کۆتایدا ژمارەیەکی زۆری توروکییەکان بە نێو ناوچەکانی باکووری رۆژهەلاتی عێراق و باکووری رۆژهەلاتی سوریادا بلاودەکەنەوە، کە تێیدا بە لایەنی کەمەوە ئەوانە کۆتایی بە زاڵبوونی بەشێکی رۆژهەلاتی دەشتی دیجلە دەهێنن.

توروکییەکان لە لایەن زازییەوە سەرکردایەتیان دەکرا، کە بانگەشەی ناونیشانی(muldānum)-ی ئیتە بەلخوم —ی کردووە.

(13) بۆ لێدوانی زیاتر سەبارەت بەم پرسە بڕوانە دواتر(ch.8).

لە هەمان کاتدا ئەوە دەردەکەوێ، کە پادشانشینی ئیتە بەلخوم هێژ وەك دەوڵەتێکی بەهێز دادەنرا.

لەبەر ئەوە بە متمانەیەکەوە ئەوە رووندەکەینەوە، کە کرۆکی ناوچەی تورروکیان دەبێت لە رۆژهەڵاتی یان لە باکووری رۆژهەڵاتی دەشتی رانیەدا بدۆزرێتەوە و شوێنی شیاویش بە وردی حەوزی ورمێ ــیە [14] ، کە لە رێگەی تەنگەبەری سەنگەسەرەوە، ئەوەی شمشارە دەپارێزێت،پێگەیشتنی ئاسانە، رەنگە بەڵگە شوێنەوارییەکان گەواهی پشتگیرکەر بە دەستەوە بدەن.

گەر ژمارەیەکی زۆری تورروکیەکان نشتیمانی شاخاویەکانیان جێهێلابێت، ئەوا لە باکووری دەشتی میسۆپۆتامیادا گیرساونەتەوە و بۆ چەندین ساڵ لەوێدا بە دەستەلاتداری ماینەوە، پێدەچێ، کە کارلێککردنێکی بەهێز لە نێوان ئەم تورروکیانە و ئەوانەی لە، نیشتیمانی رەسەنیان، زاگرۆسدا مابوونەوە، هەبووبێت.

رەنگە ئەم پێوەندییانە روونکردنەوەیەکی سەرکەوتوو سەبارەت بە بلاوبوونەوەی مەترِیالی شارستانی میسۆپۆتامیا بە نێو ئەم ناوچانەدا، بەدەستەوە بدەن.

لە کاتێکدا نەتوانرێ ئەمە بە هیچ رێگەیەکی یەکلاییکەرەوە بسەلمێندرێ، بەڵگەی شوێنەواری و نوسراو پشتگیرکردنی ئەو تیۆرەی، کە حەوزی ورمێ و ناوچەکانی دەوروبەری لە دەستپێکی هەزارەی

(14) پێشتر ئەمە لە لایەن یوسیفۆڤەوە پێشنیارکراوە(1986)، لەگەڵ ئەوەشدا لە زۆرینەی گفتوگۆو دەرئەنجامەکانی رازینیم.



دووەمی بەرلەزایندا کرۆکی پادشانشینە تورروکیەکانی پێکهێنابێت، نزیکدەکاتەوە.

ئاخۆ تیۆرێکی ئاوەها گشت گەواهییە فەراهەمەکان بگونجێنێت، کە ئەو توێژینەوانە پێویستیان پێیان دەبێت، کە لە چوارچێوەی بواری ئەم نووسینەدا نین. بێگومان کێشەیەکی گرنگ هەڵسەنگاندنی وردی بەڵگە شوێنەوارییە بەندیوارەکانی باکووری رۆژئاوای ئێرانە.

لە رووی ئارنیکەوە مەترِیالەکانی دینخە تاوەکو ئەم دوایەش یەکێکبوون لەگروهە کەم بلاوکراوەکانی گڵێنەی خابوور لە ئەنجامی هەڵکۆڵیندا، وەلێ تەواوی مەترِیالەکانی تەل براك ( Oates,oates and mc Donald 1998) و تەل لەیلان(Frane 1996) و ریماح ( postgate,oates and oates 1997) هەنووکە بنچینەکانی بەراوردکردنی باشتر لەگەڵ سیرامیکە هاوچەرخەکانی باکووری میسۆپۆتامیا بەدەستەوە دەدەن.

هەر چۆنێك بێت، ئەوە دەردەکەوێ، کە مەترِیالەکانی دینخە ئەو جۆرانە لە نێو خۆدەگرن، کە لە میسۆپۆتامیادا دەگەرێنەوە سەردەمە زووینەکانی ئەم نشینگەیە، بە شێوەیەك لە تێروانینی کرۆنۆلۆژییەوە لێرەدا تیۆری پێشنیارکراو لەگەڵ بەڵگەکاندا نامۆ نییە[15] .

(15) لەسەر بنەمای بەڵگە نوێکانی لە شوێنەکانی ئەسکی موسڵ لە باکووری عێراق لە پرۆژەیەکی
رزگارکردندا دۆزراونەوە (H.oguchi 1997) ریزبەندی گڵێنەی خابوور بۆ چوار قۆناغ دابەشکراوە، کە کۆنترینیان قۆناغی پێش شەمشی- ئەدەدە، هەروەها پێشنیارکراوە، کە گڵێنەی خابوور لە دوابەشی ئەم قۆناغەدا هێنراوەتە دینخە(ogucni 1998,120 n.3 ). گەرئەمە راستبێت تیۆری پێشنیارکراو لێرەدا بە گرنگ(مەترسیدار) دادەنرێت، بەلاّم

کێشەیەکی دیکە پێوەندی بە دابەشکردنی ناوچەیی(مکانی) گڵێنەکانی خابوورەوە هەیە لە ئێران و باکووری عێراقدا.

رووپێوی نشیتگە هاوچەرخەکان لە ئێراندا ئاماژە بە دەرکەوتنی گڵێنەی خابوور دەکات لە حەوزی ورمێدا، کە جگە لە باشوور و باشووری رۆژهەڵات، واتە ئەو شوێنەی زانیاری شیاوی بەراوردکردنی تێدا لەدەست دراوە، لە هەموو لایەکمانەوە دابڕاوە( Edwards 1986,72f. kroll 1994,165f).

لە خودی دەشتی رانیەدا، کە دەبێ بەندیوارییەکی گرنگی بە زنجیرەکەوە هەبێت، جێگەی سەرنجە تێبینی بکرێت، کە هەڵکولێنەکانی دانیمارکی لە شمشارەدا بە شێوەیەکی کردەیی گڵێنەی رەنگکراوی خابووریان نەدۆزیەوە[16] ، لە کاتێکدا هەڵکولێنەکانی عێراق لە تەل بازموسیاندا، کە کتومت پێنج کیلۆمەتر لەو پەڕی باشوورەوەیە، نموونەی روون و بەرچاویان دۆزیەوە(as-soof 1970,g4).

---

شتێکی ئاشکرایە بەڵگەی سیرامك چ بۆ پووچەڵکردنەوە چ بۆ چەسپاندنی بەتەواوی دروست نییە. بێگومان خاڵی گرنگ ئەوەیە، کە دەتوانرێ مەترِیاڵەکانی دینخە لە ماوەی دەورووی ١٨٠٠-١٦٠٠پ. ز دابندرێن، کە لەگەڵ پێشنیارەکەماندا گونجاوە: چوونە ناوەوەی گڵێنەی خابوور بۆ نێو حەوزی ورمێ رەنگە بگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی هەژدەهەمی بەرلەزایین، هەروەها کارلێك یان تەقلیدەکە بۆ ماوەیەکی زۆر (سەردەمێکی درێژ) لە دوای ئەوەدا ماوەتەوە.

(16) بۆ ئەم زانیارییە قەرزاری(I.Thuasen)-م ، کە مەتریاڵەکانی بۆ بلاّوکردنەوە ئامادە دەکرد. چەند تێبینیەکیش سەبارەت بە سیرامیکەکانی چەرخی بابلی کۆن لەشمشارەدا لە(Kramer) Hamlin 1971, 150f - دا بدۆزرێتەوە.



بێگومان ئەم شەقڵە ناڕوونانەش دەبێت چەند روونکردنەوەیەکیان هەبێت، بەلاّم لەم ساتەدا بە تایبەتی پێڤاژوویەك (context) بەم شێوەیە خۆی پێشکەش دەکات : پێش ئەوەی کارلێککردنی توروکییەکان لە نێوان ولاّتی نزم و بەرزاییەکاندا هێز بەدەست بهێنێت لە راستیدا شمشارە تالاّنکرا، لە سەرنجامیشدا نیشانەیەکی بچووك لەوێ جێهێلاّ.

لە لایەکی دیکەوە، پێدەچێ بازموسیان بە شێوەیەکی چڕ و پڕتر لەم کارلێککردنە دا بەشداریکردبێت [17].

---

(17) ئوگوشی هێژا بە گفتوگۆیەکی ژیرانە ئەوە پێشنیار دەکات، کە بازرگانی قەلاّیی دەکەوێتە پشتی بلاّوبوونەوەی گڵێنەکانی خابوور بە نێو ئەم ناوچانەدا، کە پێبچێ بازموسیان شوێنێکی کاروم(یان وەبەرتوم)-ی ئاشووری بووبێت(oguchi 1998,122)، هەروەها شمشارە نشینگەیەکی تەواو بووە. ئەمەش تیۆرێکی قایلکەر نییە، بەتایبەتی چونکە هەڵکۆڵینەکانی کولتەپە/کانیش، هەروەك لە لایەن ئوگوشی(ibid 129)- یەوە تێبینی کراوە، کە بە زۆری وەك نشینگەیەکی بازرگانی ئاشووری دۆکومێنت دەکرێت، ئەم هەڵکۆڵینانە تەنها چەند نموونەیەکی کەمی گڵێنەی خابووریان خستە بەردەست ئەویش تایبەت بوو بە گۆڕەکان. بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا شتێکی سەرنج راکێشە کەل و پەلە هەڵکۆڵدراوەکانی دەشتی راینە و دینخە تەپە و حەسانلو- لە تێڕوانینێکی پێشنیار کراوی ئێرەوە بە دەستبهێنین، بەلاّم ئەم جۆرە توێژینەوانە ئاسان نین. ئاستە جیاوازەکانی کارلێکی شارستانی نێوان ئەم ناوچانە و ولاّتی خواروی میسۆپۆتامیا بێگومان پێش کارلێکێکی تایبەتی و چڕ و پڕ تر کەوتووە، کە لە وانەیە بکەوێتە پشتی بلاّوبوونەوەی تەقلیدەکانی سیرامیکەوە. مەترِیاڵەکانی وەك چەك و خشڵ و کەل و پەلەکانی دیکەی خۆشگوزەرانی بەشێوەیەکی ئاسانتر لە گڵێنەی (mundane)، گوێزراونەتەوە، بەڵگەی ناوچەیی گڵێنەکانی خابوور لە دینخەدا بەتایبەتی گرنگ دەردەکەوێت، چونکە شایەتی بە گواستنەوەیەکی راستەقینەی بەرهەمی تەکنۆلۆژیا و تەقلیدی شارستانی دەدات، کە دەچێتە ئەو دیو سنوورە نا ئاساییەکانی بازرگانی تەواوە. ئەو بەڵگانەی پێشتر گفتوگۆکران چەند خەیاڵکردنێکی کەمی دەوێ بۆ گریمانکردنی ئەوەی گروهە توروکییەکان دوای ماوەیەکی

## لولوبووم

بەڵگەکانی پێوەند بە لولوبووم تا ڕادەیەك بە درێژی لە -50) Sh A 2 (54,cf.also) Klengel 1965 and 1988- دا تاوتوێکراون و تەنها ئەوەندە پێویست دەکات بەکورتی لێرە باس بکرێن.

سەرچاوە زووینە پەرش و بلاوەکان و بەکارهێنانی دواتری ئیتنیکون لە پێڤاژوە جودا جوداکانی زاگرۆسدا بە شێوەیەکی فراوان، ڕەنگە ئاماژە بەوە بدەن، کە توروکوم لە ڕۆژگاری رابردوودا کۆمەڵە ئاماژە پێدانێکی ئیتنۆ – زمانەوانی تایبەت و جیۆ- سیاسی هەبووە.

هەرچۆنێك بێت، ئەوە روون و ئاشکرایە، کە تاوەکو دەسپێکی هەزارەی دووەمی بەر لە زاین نازنێوەکە لە ناوچەیەکی فراوانی میسۆپۆتامیادا وەك زاراوەیەکی گروهی (generic term) دانیشتوانی شاخ بەکارهێندراوە.

هەروەها ئەمە دەردەکەوێ، کە پڕا و پڕی دانیشتوانی هاودەمی زاگرۆس بێت.

لە دەقەکانی شمشارەدا لولییەکان لە پادشانشینانی نیشتەجێبوی دۆڵەکان جیاوازن، بە شێوەیەك، کە ئەوانە دابەشی گروهی سیاسی بچووکتر بوونە، هەروەها بەسەر ناوچە فراوانترەکاندا پەرش و بلاوبوونەتەوە.

---

دوور و درێژ بەرپیوار بوونیان و رێکخستنی بەرهەمەکانی سیرامیکیان، کە بەهۆی مۆدەکانی ولاتی خواروو کاری تێکرا، گەڕابنەوە،،نیشتمانی ئەسڵیان،،.



پێدەچیٚ لە ناوچە بەرزەکان و دۆڵە سەختەکاندا نیشتەجیٚ بووبن و زیاتر مەڕومالاتیان بەخێودەکردووە و ستراتیجە بنچینەییەکانی دیکەی جگە لەکشتوکاڵیان پەیڕەوکردووە.

هاوڕێککردنە ئیتنۆگرافییەکان ئاماژە بەوە دەدەن، کە ئەم یەکە سیاسی و سۆسیۆ- ئابووریە لە پێڤاژووی شاخێکدا، کە گروهی جیاواز تێیدا چەندین ناوچەی جیاوازیان لە شێوازێکی تەواوکەرانەدا ژێربارخستووە، ئەمەش سیناریۆیەکی تەواو پێچەوانەیە سەبارەت بەم سەردەمەی مێژووی زاگرۆس (cf.also ch.8).

ئەو جیاوازییە ئیتنۆ – زمانەوانییەی لە وانەیە لە نێوان توروکی و لولییەکاندا هەبووبێت نەزاندراوە، وەلیٚ تیۆری شیاو ئەوەیە، کە گروهە لولییەکان پاشماوەی توخمەکانی خەڵکانی پێش – خوریان تێدابووە.

بە خێرایی ئاماژە بە نامەیەکی گرنك دەدەین، کە لە لایەن تسیگلەر(Ziegler 1997 b) – ەوە بلاوکراوەتەوە، کە تێیدا ئیشمی – دەگان داوای زانیاری زیاتر سەبارەت بە ئەو تێکشانەی لولییەکان بەسەر ئیشنونایاندا هێناوە، دەکات .

تیسگلەر نامەکە دەگێڕێتەوە کاتی شالاوی قەبرا، کە تێیدا دادوشە و شەمشی –ئەدەد هاوپەیمان بوونە.

بە دوورکەوتنەوە لە هەر پێڤاژوویەکی دەستەبەر ئەم بەڵگەیە بۆ هەڵسەنگاندن زەحمەت دەبێت، بەلاّم لەوانەیە پشگیرکردنێکی زیاتر بەو فکرەیە بدات، کە لولوم بە شێوەیەکی سەرەکی لەم سەردەمەدا بۆتە زاراوەیەکی ژانری(generic).

## گوتیوم

گفتوگۆی شیاوی تێگەیشتن دەربارەی گوتیوم و گوتیەکان لە لایەن هالو( 1971)پێشکەشکراوە و پۆتیش(potts 1994,24-27) پوختەیەکی نوێی بۆ نووسیوە، هەروەها بە شێوەیەکی تایبەتی زادۆك(1987,20f) دەربارەی بنەچەکی واژەکانی هەزارەی دووەمی نووسیوە، پێویستیش ناکا ئەمانە لێرەدا دووبارە بکرێنەوە.

داگیرکردنی میسۆپۆتامیا لە لایەن گوتییەکان لە کۆتایی سەردەمی ئەکەدیدا، ئینجا راستییەتی ئەم رووداوە هەرچییەك بێت، رەچەڵەکی گوتییەکانیش هەرکێیەك بووبن، ئەم خەڵکەی بە دناو کردوو لە کۆتایشدا نێوەکە بوو بە نازنێوێکی ستانداردی دانیشتوانی شاخاوی ناوەڕاستی زاگرۆس.

هەرچەندە دوا بەکارهێنانی ئیتنیکۆن بە شێوەیەکی ئاشکرا ناڕوونە و ئاوازێکی چەندین جار دووبارە بووەوەیە، تەقلیدی میسۆپۆتامیا بە شێوەیەکی تەواو چەسپاو گوتییەکان بە شاخەکانی باکووری عیلامەوە بەندیوار دەکات، هەروەها هۆکارێك نییە ئەوە گومانبار بکات، کە ئەوان لە هەزارەی سێیەمی بەر لە زایندا سەر بە ئەوێ نەبووبن (cf.zadok 1987,21,potts 1994,26n.139) [18].

(18) لەسەر بنەمای بوونی ناوەکەسییە گوتییەکان لەدەقەکانی بابلی کۆنی چەگەر بازار(ئەنەدۆڵ) ئەسڵێکی باکووری رۆژئاوا بۆ گوتییەکان، زۆر بە چەسپاوی لە لایەن فینکلایشتن (1966,107f.)- ەوە پێشنیارکراوە، بەڵام گەواهییەکان ئەوە ناسەپێنن. سەبارەت بەهەر بەراوردکردنێکی شەرعی مەتڕیالی گەلێك کەمی زمانەوانی گوتی هەیە،



هینریکسن چەندین جار بۆ هاوڕێککردنێکی ناوچەکانی لوڕستان بە سیرامیکەکانی گۆدین ۲:

Ill لەگەڵ شیمەشکیدا، گفتوگۆی کردووە، وەلێ بەڵگە سیرامیکییەکان سەبارەت بە شێوەکانی جیۆپۆلیتیکی لەم هەرێمە گەورەیەدا سەپێنەر نین، هەروەها درێژبوونەوەی گریمانکراوی پادشانشینی عیلامی سەردەمی بابلی کۆن (henrickson 1984,1986,1987) هاوڕێکیکرێت، بەڵام شتێکی دژوارە لەم کاتەدا چوارچێوەی هەر سنوورێکی دروستی نێوان زەوییەکانی عیلامی و هەرێمی گوتیدا بکێشرێت.

لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی کردەیی گوتییەکان لە ماوەی بنەماڵەی ئوری سێیەمدا دەردەکەون، بەلایەنی کەمیشەوە لە سەرچاوە هاوچەرخەکاندا، سەرەڕای ئەو راستییەی کە لەم ماوەیەدا سۆمێرییەکان دزەیان دەکردە ناوچەی رۆژهەڵات، دەکرێ وێنا بکرێ، کە بە شێوەیەکی سەرەکی بەکارهێنانی تەقلیدی زاراوەی گوتیوم بەندیوار بێت بە سەرچاوەکانی هەزارەی سێیەم و دووەمی بەر لە زاینەوە، هەروەها ئەوە وێنا بکرێت، کە گۆڕانکارییە جەوهەرییە سیاسییەکان لە ناوچە کۆنەکانی گوتیدا روویانداوە.

هەروەها دەقەکانی دیکەی چەرخی بابلی کۆنی باکووری میسۆپۆتامیا هەمان ئەو ناوە کەسیانە لیست دەکەن، کە گومانی تێدا نییە هی بنچینە ناوچەییەکانن(.cf بۆ نموونە بەڵگەکانی ئەشلەکە لە ماریۆ ١٩٩٤- دا پێشکەشکراون ). جەختکردنەوەی ئەم خاڵە چەند گرنگییەکی هەیە، چونکە تیۆرەکە دووبارە لە توێژینەوە زۆر نوێکانیشدا(وەك weiss and courty 1993,142 n. 37) دەردەکەوێت.

به هەرحاڵ، ئاماژە پێدانەکانی گوتی لە دەسپێکی هەزارەی دووەمی بەر لە زایندا پێویستە بۆ دوو پۆلی بنچینەیی جیابکرێنەوە، ئەوانەی ئاماژە بە تاکەکان یان گروهە بچووکەکانی پێیان گوتراوە خەڵکی گوتی دەدەن و ئەرکی جیاوازیان لە خودی میسۆپۆتامیادا بەدەستەوەگرتووە، هەروەها ئەوانەی بەڵگەی چالاکی سەربەخۆی دەوڵەتی گوتی بە دەستەوە دەدەن.

گروهی یەکەم، کە تا ئێستاش گەورەترین گروهە، رەنگە لەگەڵ بەڵگە ئاو دا مانە کانەکانی خەڵکێك، کە پێیان گوتراوە عیلامی و لە هەمان پێڤاژووەکاندا دۆزراونەتەوە، بەراورد بکرێن، کە لە پێگە ناسەرەکییەکاندا کاریانکردووە، هەروەها پاسەوانی یان جاشایەنیشیان کردووە.

به هەمان شێوە هەروەك لە دەقە بابلییەکاندا دەزاندرێ، گوتیەکانیش گروهی تایبەتی پاسەوانان یاخود جاشانیان دروستکردوون( zadok 1987,20f)، هەروەها ئەو دەقانەی بی. لافونت ( B.lafont 1986)بلاۆیکردنەوە ئەوە پێشاندەدەن، کە یەسمەخ — ئادو لەماریدا پاسەوانی گوتی هەبوونە. لە راستیدا هەرە زۆری ئاماژەپێدانەکانی لە دەقەکانی ماری دا بە خەڵکی نێوبراو بەگوتی دراون پێدەچێ بچنە ژێر ئەم گروهەوە، هەروەها جێگەی سەرنجە ئاماژە بەوە بدرێت، کە هەمان گروه لە شارۆچکەکانی دیکەی وەك رەزەما (armt xxv,624,rev.11) و ریماح و لەیلانی باکووردا هەبوونە(ئاماژەیان پێدراوە). لە ریماحدا گوتییەکان لە دەقەکانی ئەرشیڤی مەی — دا باسدەکرێن(هی سەردەمی لیمو سەبڕوم —ە )، کە پێوەندی بە گەشتێکی شاهانەی شارۆچکە بچووکەکانەوە هەیە و زۆریش لە ریماح نزیکن، لیستەکەش بۆ ئەفسەرێکی گوتی دەنێردرێت (obtr,253,254,260).



دەقە مێژوو نادیارەکانی بیرە، بەلاّم لەوانەیە هاوچەرخ بن، لیستەکە بۆ گوتییەکان دەنێرێ (obtr,267,68,271). گروهی ئەم دەقانە تایبەتمەندی هاوبەشیان لەگەڵ ئەو دەقانەی ماریدا هەیە، کە لافۆنت بلاۆیکردنەوە، گومانیشی تێدایە گوتییەکان لە ریماح هەمان ئەرکیان بینیوە.

لەبەر ئەوە پێدەچێ بوونیان گوزارشت لە دوو دەرکەوتنی ئیتنیکون بکات لە دەقەکانی ئەرشیڤی تەل ئیلتانی —دا (obtr,81 and 198).[19]

هەمان حاڵەت لە لەیلانیشدا هەیە، کە تێیدا دەقەکانی دەوروبەری ١٧٥٠-١٧٣٠ پ.ز گروهی گوتیان لە خابووردا باس دەکەن ( cf. indices in lsmail 1991 and vin cente 1991). لە هەموو ئەم نموونانەشدا نازنێوی گوتی بە مانایەکی فراوان وەك ئاماژەپێدانی ،،دانیشتوانی ناوچە بەرزەکان،، بەکارهێندراوە، نەك وەك ئاماژەپێدانێکی ئیتنۆ- زمانەوانی تایبەت.

---

(19) cf. ئەو بەڵگانەی لە لایەن زادۆکەوە کۆکراونەتەوە ARMT 1987,20f XXV,140، کە زیو بۆ حەڤدە گوتی دەکاتە لیست، ئەو دوو نیوەی ماونەتەوە هەردووکیان ئەکەدین. نێوی(i-la_si)لە(OBTR 198,3)-دا لای من روون نییە، بەلاّم لەوانە ئەویش هەر ئەکەدی بێت(لە lli-asÎ?) یەوە- کورتکرابێتەوە. دەقەکانی،، ژەمی خواردن،،- ی هەریەك لە ماری و ریماح ئەوە پێشاندەدەن گوتییەکان پێگەی ممتازیان هەبووە، هەروەها لە وانەیە مافی چوونە ناوەوەی ناوچەکانیان هەبووبێت، ئەگەرێکی دیکە پێوەندی بە خزمەتکارییەوە هەیە، یا- دووبارە- ئەوانەی نێوی ئەکەدیان لێیە رەنگە هی بەرێکی دووڕە(Second-generation) بن.

لە چەند بارێکی کەمدا نێوی کەسانی بەگوتی نێو زەندکراو، بە زۆری نێوی ئەکەدین، شەقڵێکی ئەوەش دەتوانرێی چەند روونکردنەوەیەك پێشنیار بکات.

بێگومان چەند رێگەیەك هەبوونە، کە تێیاندا تاکە کەسەکان یاخود گروهی بچووکی خەڵکی توانیویانە لە زاگرۆسەوە بگەنە شارۆچکەی دەشتەکان، وەلێ سەبارەت بەم،، گاردە،،گوتیانە لە کۆشکەکانی باکووری میسۆپۆتامیادا، هاوردنێکی رێك و پێك یاخود راگوێزانێك لە رۆژهەلاتەوە ناتوانرێ تایبەت بکرێت.

شتێکی مەعقولە گاردە گوتییەکان لەگەڵ ئەو جەنگاوەرە جەرمانیانەدا بەراوردبکرێن، کە لە ئیمپراتۆرییەتی رۆمانیدا کاریان دەکرد، یان لەگەڵ ئەو گاردە نێودارانەی سەربازانی سویسرپیدا بەراورد بکرێن، کە لە مێژووی نویێ ئەوروپادا ناسراون.

بە چاوپۆشین لە مێژووی ساڵەکی(year-formulae) و بەڵگەکانی شمارەی لەم بەشدا گفتوگۆ کراون، بەگەڕانەوە سەر پۆلی دووەمی سەرچاوەکان یەکێك لە کۆپییەکانی بابلی کۆنی نووسینەکانی پادشای گوتی ئێریدو — پیزیر تێبینی دەکات (Frayne 1993,220,228).

ئەو سەرچاوانە جەنگی ئێریدو — پیزیر لە دژی شیمورڕوم و لولوبوم، لەگەڵ جەنگی هەرێمە شاخاوییەکان و تێکشکانی نیریشخوخای ئێنسی (ensi) هەولێر(erbïl) لە بەرامبەریدا، دەگێڕنەوە.

هەرچەندە ئەم بوویەرانە دەبێت گەلێك لە سەردەمی ئێمە کۆنتر بێت، بەلاّم شتێکی گرنگە تێبینی بکرێت چۆن سیناریۆی جیۆ- سیاسی دەقا



و دەقی رەوشی بابلی کۆنە، کە تییێدا گوتییەکان بە شێوەیەکی تەواو دەستیان وەرداوەتە کاروباری شیموروم و هەرێمی دەوروبەری هەولێر(بڕوانە: ch.۷).

سوپایەکی ۱۰/۰۰۰هەزار گوتی پێدەچێ لە ژێرەی فەرماندەیی پۆلوخ — یێکی ناسراو[20] پشگیری شالاّوی عیلامییەکانیان کردبێت لە میسۆپۆتامیادا (lacambre 1997,450sub,c) in zl g, 10,.

هەروەها گوتییەکان لە شوبات- ئینلیل- دا بەشێکی سەربازگەی عیلامیان پێکهێناوە (charpin 1986).

لەم دەمەدا دووچاری شتێکی نادیار دەبینەوە، هەروەها دووچاری نەواریتوم -،،شاژنی،، گوتی گەلێك قسە لەسەرکراو دەبینەوە<[21]

وا دیارە سەربازەکانی عیلامی لە چەند شوێنێکی نزیکدا لە گوتیوم جەنگاون و نەواریتوم —یان دەستگیرکردووە و، دواجار ئازادیان کردووە(armll 26).

ئەم خانە لە (arm vl 27)-یشدا باسدەکرێ، کە ئەوە دەزانین ۱۰/۰۰۰(دە هەزار) گوتی لە دژی لارسە رەوانە دەکات.

[20] دەقەکە qü-tu-ü lu üpu-lu-uh-ی تێدایە( A.366g+,14;Lacmbre 1997,446,ff) کە نووسەرەکە وەریگێڕاوە،،... تەواو جێگەی ترسە. گوتییەکە...،، بەلاّم دەبێ والێی تێبگەین کە،، وە پولوخ، گوتییەکە...،،.

[21] بڕوانە: .Astour 1987, 17n.98. سێیەم ئاماژەپێدان بە تەواریتوم، لە ARMT XXVI/2 470 — دا ناکرێ بەبێ گومان دابنرێ.

درێژەی ئەم بوویەرانە هێژ روون نییە، وەلێ باس لێوەکردنی ئەوەی دەبێت شاژنێکی گوتی یاخود ئەمیرەیەك بێت بێگومان جێگەی سەرنجە.

دەرئەنجامی شیاوی لە نێوەکەیەوە هەلبهێنجرێت، ئەوەیە لە هەرێمی نەوارِ نەمارِ-ەوە هاتووە(واتە خەلّکی ئەو هەرێمەیە)، ئەمەش ئاماژە بەوە دەدات، کە ئەم هەرێمە دەکرێ بە بە شێك لە گوتیوم دابنرێت.

پادشانشینی گوتیوم وەك هەریەك لەتوروکوم و عیلام دەبێت لە یەك کاتدا تێرمێکی جیۆ سیاسی ناجێگیری هەبووبێت( fluid geo-political term)، و بەدلّنیایشەوە لە چەند دەولّەتێکی جیاواز پێکهاتووە.

لە دەقەکانی شمشارەدا گوتییەکان لە ژێر سەرکردایەتی ئیندوشە ناوێکدا دەردەکەون [22].

وادیارە لە دەقەکانی دواتردا سەرکەوتبێت یان زازوم جێگەی گرتبێتەوە(بڕوانەch.7)، لە کاتێکدا لەوانەیە نەواریتوم خەلّکی بەشێکی باشووری ناوچەکانی گوتی بووبێت.

## عیلام

دەولّەتی عیلامی سەرەتای هەزارەی دووەمی بەر لەزاین دەولّەتێکی کۆنفیدراسیۆنی بوو، کە لە دەشتی سوسیانا/ خوزستان و ولاّتە شاخاوییەکانی دەوروبەری، بە شێوەیەکی بەر چاویش ئەنشان(ناوچەی

[22] دەربارەی نووسینە جیاوازەکانی ئەم نێوە بڕوانە(index). هەمانە نێو وەك نێوی پادشایەکی ئوری سێیەم لە شیمەشکیدا دەردەکەوێت(cf. sha 2,4g)، هەروەها بۆ خابیرِو لە تیکونانوم(Salvini 1995,prism col, iii,50:Iin-da-a-zu).



دەوروبەری تەل ئی — مەلیان لە فارس) و شیمەشکی(پێدەچی لورِستان بێت) پێکدەهات. دەولّەتی عیلام بە پێی پێکهاتە کۆنفیدرەیت(یەکگرتوو)سێ فەرمانڕەوای خودان تەمەن و پایەی کۆمەلاّیەتی نایەکسانی هەبوو، کە بە گوێرەی پیڕۆیەکی فەرمانڕەواتی پادشایەتی، کە هێژ کەم لێی تێدەگەین، کاریاندە کرد( stolper 1982,vallat 1994). بەگوێرەی گوتەی ڤەلاّت پادشا یاخود،،پیاوی گەورە،، (ugula rabûm,69) لە ئەرشیڤەکانی شمشارە دا، سیروك-توخ(64:ŝuruh-uh) لەوانەیە سێ کورِی هەبووبێت. سیموت — وەرتاش، ئەوەیە کە پێش باوکی مردووە.

سیوێ- پەلەر- خوپاك، ئەوەیە، کە جێگەی باوکی گرتۆتەوە، بەلاّم پێدەچێ کورِی نەبووبێت، بۆیە براکەی کورِی کودو- زولوش (؟)، کوتیر — نە خونتی جێگەی گرتەوە(vallt 1994,6).

لە چەند توێژینەوەیەکی نوێدا دوراند و شاغیا (charpin پێشانیانداوە چۆن پادشای عیلامی خۆی بەجۆرێك لە،، ئیمپراتۆر،، زانیوە و بانگەشەی سەردەستەیی ناوی (nominal suzerainty) لەسەر پادشانشینەکانی میسۆپۆتامیا کردووە ( charpin and durand 1987b; Durand 1994b).

سیوێ- پەلەر- خوپاك، وەك زۆربەی پادشا عیلامییەکانی پێش خۆی و پاش خۆی هەولّی داگیکردنێکی راستەقینەی میسۆپۆتامیای دا، بەلاّم چەند سەرکەوتنێکی سەرەتایی بەدەستهێنا (vallat 1996,314f).

ئیشنونای داگیرکردوو هێرشی کرده سەر خابوور(charpin 1986b)، بەلاّم لە کۆتایدا پادشاکانی ولاّتی خوارو لە دژیدا هێزەکانیان یەکخست (Durand 1986) و لەخیریتوم-ی باکووری بابل- دا تێکشکانێکی یەکلایکەرەوەیان بە سەر عیلامیەکاندا هێنا(بڕوانە: lacambre 1997 with further literatwke).

بێگومان سیاسەتی عیلامیەکانی لە نێو زاگرۆس، لە سنووری باکوور و رۆژهەلاّتدا زۆربەکەمی دوکۆمێنت کراوە. هەرچۆنێك بێت، نامەی (٦٤) ئەوە پێشاندەدات، کە سیرۆك — توخ لە دژی گوتییەکان لەگەڵ توروکییەکاندا بەشداری جەنگی کردووە.

لەگەڵ ئەوەشدا (بەشێکی) پارچەیەکی تا رادەیەك بەرگومانی بەڵگەکان وادیارە گونجاو بێت لەم بارەیەوە باس بکرێت، کە ئەو کێلەنووسە عیلامییەیە فاربەر(١٩٧٥)بلاّویکردەوە.

بە داخەوە ئەم کێلەنووسە لە هەڵکۆڵینی رێك و پێکدا نەدۆزراوەتەوە و شوێنی ئەسلەکەشی بە،،ئێران،، دەدرێ.

ئەو کێلەنووسە پاشماوەی نووسینێك بە زمانی عیلامی لە نێو خۆ دەگرێت، هەرچەندە تا ڕادەیەك شکاوە، ناوی پادشا کە لەسەرەتادا بە شێوەیەکی مەعقول هەروەك بلێی سیروك —توخ —یەکەم -ە نۆژەنکراوەتەوە.

بە شێوەیەکی گشتی دەقەکان لسیتی چەندین ناون، وشەی دوخ ،،ئەوگرتی،، لە دوایانەوە دێت.



گومانێکی بەندیوار بەوەوە هەیە، کە ئاخۆ ناوەکان ئاماژە بە ناوی کەسی یان ناوی جوگرافی دەدەن، بەلاّم دەقەکە ئاماژە بە سیاسەتێکی دوژمنکارانەی عیلامی لە بەرامبەر خەڵکی رۆژهەلاّتی میسوپۆتامیا و تەنانەت پێدەچێ لە ناو زاگرۆس —یش، بدات.

ڤەلەت(vallat 1996,314) بەم دواییانە پێشنیاریکردووە، کە ئەم شالاّوە بەهۆی فراوانخوازییەکانی شەمشی —ئەدەدەوە بووە بەرەو رۆژهەلاّتی، بەلاّم بە روانین لە رووداوە گفتوگۆکراوەکانی نێو ئەم بەرگە، ئەم پێشنیارە پێناچێ وا بێت.

هەرچەندە ئەمە بە شێوەیەکی کاتییە، بە شێوەیەکی راستتر شالاّوەکە لە وانەیە بە بەشداریکردنی عیلام لەکێشمەکێشمەکانی لەگەڵ گوتی و کاکموم- دا پێوەند بێت (cf. E iden 1985,gl n. 43).

## سەرچاوەکان


1- ARMT: Archives Royales de Mari (Textes). Paris 1950.

2- Astour, M. C. “Semites and Hurrians in Northern Transtigris”, in studies on The civilization and culture of Nuzi and The Hurrians 2. Eisenbrauns, Winona Lake, 3 – 68. (1987).

3- Charpin, D.

1985: “Données nouveues surla chronologie des souverains d’ Ešnuna”, in Durand and Kupper (eds) 1985, 51 – 66.

1986: “Les Elamites en šubat – Enlil”, in de Meyer, Gasche, and Vallat (eds) 1986, 129-37.

1992 a: Noms d’années et eponyms ā Mari” NABU 92, Section 30.

1992 b: “ Im migers, reugiés et deportés en Babylonie Sous Hammu – rabi et ses successeurs, in charpin and joannés (eds) 1992, 207-218.

1994 a: “Une decollation mystérieuse” NABU 1994, Section 59.

1994 b: “Une Campagne de Yahdum – Lîm en Hante – Mēsopotamie” in charpin and Durand (eds) 1994, 177-200.

1994 c: Review of Sh A2, Syria 71, 456 – 460.

4- Deller, k.

1990 b: “Eine Erwāgung zur Lokalisierung des aB ON Qabrā / Qabarā” NABU 1990, Section 84.

5- Dittmann, R.





1995: “Ruinebe schreibungen der Machmur – Ebene aus dem nachlas von walter Bachmann” in Fink beiner, Dittman, and Haupt mann (eds) 1995, 87-102.

6- Edwards, M.

1986: “Urmia ware and its distribution in north western Iran in the second Millenlaium B.C:

A Review of the Resuits of Excavations and surveys” Iran 24, 57-77.

7- Eidem, J.

1985: “News from The eastern Front: The Evdence.

From Tell shemshāra” Iraq 47. 83-107.

1991 a: “An old Assyrian Treaty from Tell Leilan” in charpin and Joanés (eds) 1991, 185-207.

1996: “North Syrian social structure in The MB Period. New Evidence from Ten Leilan” in Ismail (ed) 1996, 77-85.

8- Falken Stein, A.

1961: Review of LaessØe 1959 a, ZA 54, 286-288.

9- Farber, W.

1975: “Eine Elamische inscrift aus der 1 Hālfte des 2. Jahrtause hds” ZA 64, 74-86.

10- Frane, F.

1996: “The Ten Leilan period I Habur Ware Assemblage.

Ph. D. Diss. University of North Caroline at chapel Hill.

11- Frayne, D. R.

1990: old Babylonian period. The Royal In scriptions of Mesopotamia. Early periods 4. University of Toronto Hill.
1993: Sargonic and Gutian Periods. The Royal Inscriptions of Mesopotamia. Early periods 2. University of Toronto press.
1997: Ur III period. The Royal Inscriptions of Mesopotamia. Early periods 3/2. University of Toronto press.
12- Finkel Stein,
1966: " The Geneology of The Hamurabi Dynasty" Jcs 20. 95-118.
13- Fincke, J.
1993: Die orts – und Gewässer namen der Nuzi – Texte. Beihefte Zum Tübinger Atlas des Vordern Orients. Repertoire Geographique des Textes Cunéiformes 10. Wiesbaden.
14- Good nick – Westenho 12, J.
1997: Legends of The Kings of Akkade. Eisenbrauns, Winona Lake, Indiana.
15- Gary son, A. K.
1974-77: " The Empire of Sargon of Akkad" Afo 25, 56-64.
1987: Assyrian Rulers of The Third and Second Millennia B. C. The Royal Inscriptions of Mesopotamia – Assyrian Periods 1. University of Toronto Press.
16- Hallo, W.
1971: "Gutium" RLA Bd. 3, 708-720.
17- (Kramer) Hamlin, C.



1971: The Habur Ware Ceramic Assemblage of Northern Mesopotamia, Univ. of penn. Ph. D. Diss., Univ. Microfilms, Ann Arbor.
1974: "The Early Second Millennium Cermic Assemblage at Dinkha Tepe" Iran 12, 125-153.
18- Heimpel, W.
1996: "Two notes on Ekallatum" NABU 1996, Section 101.
19- Henrickson, R. C.
1986: "A Regional Perspective on Godian III Cultural Development in central Western Iran" Iran 24, I-55.
20- Klengel, H.
1985: "Nochmals zu den Turukkāern Undihren Aufreten in Mesopotamien" Altorien talische for Schungen 12, 252-8.
1962: 1962: "Das Gebirgs Volk der Turukkū inden Keilschriftexten alt baby lonscher zeit: Kilo 40, 5-22.
1988: "Lullu(bum)", RLA Bd 7, 164-168.
21- Kroll, S.
1994: "Habur – Ware im osten", in Calmeyer et alii(eds) 1994, 159-66.
22- Kupper, J-R.
1990 a: "Zaziya, prince, d'Ita – Palhum" NABU 1990, Section 131.
1990 b: "Une Lettre du général Yassi – Dagan" MARI. 6, 337-347.
1992: "Letters 'barbares' de shemshāra" NABU 1992, Section 105.

1994: "Une Contribution á l' Histoire du verre dans le proche – orient" in Gasche et alii(eds) 1994, 265-270.

1997: "Notes de lecture: šikšabbum Again" MARI, 8, 785-786.

23- Lacambart, D.

1997: "La bataille de Hiritum" MARI 8, 431-454.

24- Lafont, B.

1985: "Le Sabum du roi de Mari an temps de yasmah – Addu" in Durand and Kupper(eds) 1985, 161-80.

25- LaessØe

1959 a: The Shemshara Tablets, A preliminary Report. Arkaeol. Kunsthist. Medd. Dan. Vid. Seisk. A 13, Copenhagen.

26- Levine, L.

1974: "Geographical Studies in The Neo – Assyrian Zagros" Part II, Iran 12, 99-124.

27- Nashef, K.

1982: Die Orts-und Gewāsser namen der Mittelbabylonischer und Mittel Assyrischen Zeit.

Beihefte Zum Tūbinger Atlas des Vordern Orients.

Répertoire Geographique des Textes Cunēiformes 5.

28- Merello, P.

1997: "Liqtum, reine durundum" MARI 8, 455-459.

29- Moorey, P. R. S.



1994: Ancient Mesopotamia Materials and industeies. Clarendon press, Oxford.

30- Oates, D. , J. Oates and Mc Donald.

1998: Ten Brak I: The Second Millennium.

Mc Donald institute and British School of Archaeology in Iraq.

31- Ouguchi, H.

1997: "A Reassessment of The Distribution of Khabur Ware: An approach from an Aspect of its main phase", Al – Rāfidān 18, 195-224.

1998: "Notes on khabur Ware from sites outside its main Distribution Zone", Al – Rāfidān 19, 119-133.

32- Postgate, C., D. Oates, and J. Oates.

1997: The excavations at Ten Al Rimah: The Pottery. Iraq Archaeological Reports 4.

Warminster, Aris and Philips.

33- Potts, T.

1994: Mesopotamia and The east. An Archaeological and Historical Study of The Foreign Relations 3400-2000 B.C. Oxford.

34- Rowton, M.

1987: "The Role of Ethnic invasion and The chiefdom Regime in Dimorphic interaction: The post – kassite period (ca. 1150-750 B.C)" in F. Rochberg – Haiton (ed.), Language, Literature and History. Philological studies presented to Erical Reiner. American orientan series 67, New Haven, 367-378.

35- Rōlling, W.
1997: “Muški” RLA Bd. 8, 493-495.
36- Rubinson, K.
1991: “A mid – Second Millennium Tomb at Dinkha Tepe” AJA 95, 373-394.
37- Salvini. M.
1996: The Habiru prism of king Tunip – Teššup of Tikunani. Documenta Asiana 3; Rome, Instituti editorial epoligraphic Internazionali.
38- al – Soof, B. A.
1970: “Mound in The Rania Plain, and Excavations at Tell Bazmusian” Sumer 26, 65-104.
39- Stolper, M.
1982: “on The Dynasty of šimšaki and Early Sukkal mahs” ZA 72, 42-67.
40- Vallat, F.
1994: “Succession Royale en Elam an IIē Millenaire in Gasche et alii(eds) 1994, 1-4.
41- Vincente, C.
1991: The 1987 Tell Leilan Tablets dated by The limmu of Habil – Kinu. Yale University Ph. D. dissertation.
42- Weiss, H and M. A. courty,
1993: “The Genesis and Collapse of The Akkadian.

Empire: The Accidental Refraction of Historical Law” in M. Liverani(ed.), Akkad. The First World Empire, paudua, 139, 131- 155.
43- Yosivof, Y. B.
1986: “on The Ancient population of The Urmia Lake Region” AMI 19, 87-91.
44- Zadok, R.
1987: “Peoples from The Iranian Plateau in Babylonia during The Second Millennium B. C. Iran 25, 31-51.
45- Zeigler, N.
1997 b: “L’armée – quell monste” in charpin and Durand(eds) 1997, 145-152.